## خوینەری بەریز ! ٠

هەموو ئەزانین کە ( پیرەمێرد ) ی ئەدیبو شاعیری نـەمری
کورد لە زۆر مەیدانو ماوەدا ، بەشێوەیەکی سەرکەوتوانەو بـە
پێهاتوویی ، دەستێکی بالآو درێژی خزمەتو رەنجی دلسۆزانەی
بووە ، هەرلەشیعری بەسۆزی‌نەتەوایەتیو نیشتمانیو کۆمەلآیەتیو
دلداریو سروشتیو دەروونیو مناڵانەوە تائەگاتە نووسینیچیرۆکو
بەسەرهاتی بەکەڵکو باسو خواسی مێژوویی پیـــاوە ناودارەکانی
کورد ، هەر لە بەرێوەبردنی کاروباری چاپەمەنیەوە تا ئەگاتـــە
ئەرکی گرانی رۆژنامەگەری ، هەر لە ئەرکی پێگەیاندنو گەشە
پێدانی زانستیەوە تا ئەگاتە لەسەر کردنەوەی مافو سەربەستی
ئافرەت ، هەر لە کۆکردنەوەی پەندی پێشینانو رێك خستنیەوە تا
دەگاتە کۆکردنەوەو نووسینەوەی گاڵتەو گەپی ناو کوردەواری ٠

ئەم کۆمەڵە نووسینو بەسەرهاتو سەرگوزەشتەو قسـە خۆش
خۆسانەی لە دوو توێی بەرگی ئەم کتێبەدا کۆکراونەتـــەوە ،
بەرهەمی پێنووسە نووك تیژەکەی پیرەمێردو بەری رەنجی پیرۆزی
خەمخۆرییەی ئەوە کەلەسەر لاپەرەکانی رۆژنامەی ( ژیان ) لـــە
ساڵەکانی ١٩٣٤ و ١٩٣٥و ١٩٣٦ ەوە بەزنجیرە بلاوی ئەکردنەوە

ئەم نووسینانە ، جگە لەوەی کەنرخو بایەخێکی کۆمەلآیەتییان
هەیە ، چەن رەوشتو عادەتێکی ئەم کوردەواریەش ئەخەنە بـــەر
چاوی نەوەی ئێستاو لەمەولا ، لە رووی زمانو ئەدەبیفۆلکلۆری

ئەم گەلەوە ، جێگەیەکی تایبەتی هەیە،بەشێوەی دەربڕین‌و چۆنێتی دارشتن‌و بەکارهێنانی وشەی کوردی پەتی ، کەبەداخەوە ، ئەو جۆرە وشانە خەریکن بەرەو نەمان‌و بیرچوونەوە ئەچن ، ئەگەر رۆڵە دڵسۆزەکانی کورد مشووری زیندوو کردنەوەو بەکارهێنانیان نەخۆن لـە بەرهەمەکانیانا .

هەروەها ئەم زنجیرە نووسینە چەن لاپەرەیەکی گەش‌و روناکی ( پیرەمێرد ) خۆیمان بۆدەرئەخات ، جگەلە وێنەگرتن‌ودەرخستی ئەو سەردەمەی کە ئەوی باژیاوە. بەشێوەیەکی ساکارو پێکەنیناوی کە تەواو زاخاوی مێشك‌و دڵو دەروونی هەموو لایەك ئەداتەوەو بە هەموو کەسێکی ئەسەلمێنێ کە کورد خاوەنی گەنجینەیەکی نەبن نەهاتووی ئەدەبی فۆلکلۆری‌و کاریزێکی هەمیشە تـەقیوی هەرگیز وشك نەبووی ئەم جۆرە ئەدەبەیە . کە ( پیرەمێرد ) لەژێر ناوی ( گاڵتەو گەپ ) دا بۆمانی ئەگێرێتەوە . کەواتە پاکۆی تاسە بۆ ( پیرەمێرد ) شل بکەین کە بێ‌دەنگ لەسەر لاپەرەکانی ئەم کتێبە ئەم بەسەرهاتە نوکتەو سەرگوزشتەو باس‌و خواســــە خۆش‌و، خۆشانەمان بۆ بگێرێتەوە ، بەم گوێ گرتنە هەم بادێکی بـیرۆزی ئەکەینەوەو کەڵك‌و سوودی تەواوی لێ‌وەرئەگرین‌و هەم چاومان زمانە تەڕو پاراوەکەی باوك و باپیرمان‌و بە ئەدەبە جێماوەکەیان ڕوون ئەکەینەوە ؟ .

**کاکەی فەللاح**

## کەم خور

پیاوێکی زۆر خور رۆژێ لە بەغدا ئەچێتە نانەواخانەیەکی سەر شەت لەگەڵ نانەوادا نرخ ئەبڕێ کەبە مجیدیەك تێری کا ، نانەوا نان ئەبرژێنێ کابرا ئەیخواو مستێ ئاوی سەرشەتی بەسەرا ئەخواتەوە ، نانەوا هەویری نامێنێ وئەو تێرناخوا ، لێ ی ئەپرسێ : تاکەی ئەخۆی ؟ ئەڵێ: ناخوا ئەم جۆرە ئاوەی دابێ بەسەریا بخۆمەوە منیش ئەخۆم تۆیش مەرجو بەڵێنت داوە تێرم کەی . . نانەوا پارەکەی ئەداتەوەو ئەڵێ برۆ .

## بێ ئیشتیهایی

پیاوێکی هەرمنی شەوێ میوانێکی دێ ، ئێوارە هەرچی نانو چێشتێکی خوا بەوانیداوە میوان ئەیخواو تێر ناخوات ، نانی دەرو دراوسێشی بۆ ئەچنەوە هەر لووشەی دێو بەبرسیتی سەر ئەنێتەوە ، بەیانی کەهەڵدەستێ ئەڵێ : ئەچمە سەر (پیری شەوکێل) مەعیدەم بەستراوە هیچم پێ ناخورێ بەڵکو ئیشتهام بکرێتەوە . خانەخوێیەکەش ئەڵێ : وەك دوعا بۆ خۆت دەکەی ، دوعایەکیش بۆ من بکە ، ئەڵێ : دوعای چی بۆتۆ بکەم ؟ ئەڵێ بڵێ یاپیری شەوکێل ! جارێکی تر ئەم میوانە رێی نەکەوێتەوە ماڵی ئێمە .

## جلـــدروو

یەکێ کە ئەیزانی وەستا حەمەسەعیدی خەیاط زۆر درەنگ جل

ەواو ئەکات ئەچێتە لایو ئەڵێت وەستا ! هاتووم دەستێ جل بۆ
کوڕە بچکۆلەکەم بکەم • وەستاش ئەڵێت : بەسەرچاو کوڕەکەت
بێرە بائەندازەی بگرم • کابرا ئەڵێ : نا ، هیچ پێویست ناکا
کورەکەم بێت ، تۆبنە بەقەدخۆم ببڕە تاتەواوی ئەکەی کورەکەم
گەورە ئەبێت •

## هونەر هونەری ئەوە

تەناف بازێك لە سنەوە هاتبوو لەسەر تەناف یاری دەکرد ،
هەندێ هونەری وای ئەنواند فەلاکەت بوو ،بیمی مل شکانی
تیابوو ئەو لەسەر تەناف ئەوەی ئەکرد ، لە خوارەوە کابرایەکی
لەگەڵ بوو پێیان ئەگوت : فس فس پاڵەوان هەڵدەپەریو بانگی
ئەکرد هونەر هونەری مەس •

## رووی وەرگێڕاوە

مەلایەکی دێکانی رۆژێ بەجەخت ئەیگوت : نەکەن بەرەوقیلە
میز بکەن کافر ئەبن • هەر ئەو رۆژە خۆی لە کێوی بەسەیێوە
بەرەو قیلە میزی ئەکرد ، وەیزانی کەس چاوی لێ نییە ، تومەز
کابرایەك لەپەنا دەوەنێکدا دانیشتبوو ماندووی بحەسێتەوە چاوی
لێبوو بانگی کرد : مەلا ئەوەچی دەکەی و لەمزگەوت چیت گوت
مەلایش وتی من خۆم هەر چەند رووم لەقیلەیە بەلام رووی
ئەوم وەرگێڕاوە، بۆیەکێش بەپێوە میز دەکەم بەلاقما هەڵنەپرژێ

## بێ مەسلەکی

مەلا ... لەبەر مزگەوتی مەلا ئەوڵای رەش قوتابخانەی دانابوو ریشی ماش‌و برنج بوو ، ژنی نەهێنابوو ، سادە پەرست بوو ، قوتابیەکی زۆر جوانی بوو ، رۆژێ بە قوتابیەکەی گووت : بە خوا تۆ زۆر جوانی ، ئەویش وتی : ماموستا دایکم زۆر جوانە تۆبە منیش جوانم ، ئەویش ئاخێکی هەڵکێشا وتی : بیستووە زور شیرین‌و نازدارە خۆزگە جارێکم ئەدی ، کوڕە بۆ دایکی گێڕایەوە ، دایکەکەی زۆر خۆش مەشرەب بوو وتی : بەیانی ئەچمە ماڵە دراوسێ نان‌ئەکەم پێ‌ی بڵێ‌بێت کولێرەیەکی گەرمیش بخواو ترسەیری منیش بکات،مەلا لەخۆشیانا ئەو شەوە نەسرەوت بەیانی هەندێ مەرەکەبی لەموو سیەکانی هەڵسوو چووە سەر تەنوور مەفتوونی ئافرەتەکە بوو بوو یەرە تەندووریش گەرم‌بوو ئارەقی کرد بەدەست دەم‌و چاوی ئەسڕی تومەز مەرەکەبەکەی ریشی بەعارەقەوە هەموو دەم‌و چاوی رەش کردبوو ئافرەتەکە ئاوێنەی لە باخەڵی دەرهێناو وتی : مەلا ! جەزای بێ مەسلەکی ئەمەیە سەیری ئاوێنەکە ،مەلاش‌دووانی رووی رەش بووەهەڵساو بێ‌ووڕنە چووە دەرەوە .

حەمزەی مەصرەفی بابیەم

کە رۆمی ئەم وڵاتەیان گرت پیاو ماقووڵەکانی زەمانی ئەحمەد

پاشا گیران ، لەسەر دیواری کۆمە قشڵەکەو بانی مالی کـــاک ئەحمەدی شێخ جوخمەیەکیان کردبوو ، لەوێ حەبس بوون ، شەوێ پەنجەرە ئەشکێنن‌و باز ئەدەنـــــــە خوارەوە ، حەمزەی مەصرەف کە بایرمە پێ‌ی دەشکێ فەتاحە تیرەی پیاوی ئەیکاتـــە کوڵ دەرباری ئەکا ، ساکەمێ ئەروا ، خۆی هەڵدەتەکێنێ دەڵێ ئاغا ! ئیتر نابێ بێ‌دڵی من بکەی وامن تۆم کڕی‌یەوە .

حەمزەش دەڵێ دامنێ‌دا . . حەیانێ کەمن تادەمرم قەرزاری تۆبم بەدەستی قوماندانێکی مەردی رۆمی لەناوچێ چاکترە .

# کوونەکەی لی دەگرم

کابرایەك کەوتبوە ساڵەوە ، هەر چەند لە عومری ئەدوان ئەو خۆی بچووك ئەکردەوە . رۆژێ وتی‌یان : تۆ چەند ساڵی ؟ وتی برایەکم هەیە ۳۲ ساڵە دوو ساڵ لەمن بچووکترە ئـــەو براکەی ترم ۳۰ ساڵە پێنج ساڵ لەمن بچووك ترە . خوشکێکم هەیـــــــە ئەمساڵ لەعومری ۲۵ ساڵیداداوماندە بەشوو ، دەساڵ لەمن‌بچوکترە کورەکەم ۱۸ ساڵە ۳ ساڵ لەخۆم بچووکترە .

محمد بەگی‌حاجی رسول‌بەگ لەوێ ئەبێ‌جەوالێك هەڵدەگرێ‌و ئەڵێ : ئێوە بیگرن ، تامن دەچم کوونەکەی لێ‌دەگرم وردە وردە خەریکە بگەرێتەوە ئەوێ .

## مای بارد ئاوی پەتی یە

کوردێك ئەچێتە بەغدا ئەوسا ئاوی کومبانیا نەبوو ، سەقا ئاوی ئەفرۆشت ئەبینێ کابرایەك گۆزەیەکی زەردی پلّ پلّەداری کردۆتە مل ، هەندێ گێزو گوڵنگ تێخستووەو دوو جامی زەردی بە دەستەوەیەو ئەیدا بەیەکاو زرەی لێ دێنێو هەر بانگ ئەکا : مای بارد ، مای بارد .

کابراش مەنالیکێکی ئەداتێ جامێکی بۆ تێ ئەکا ئەیخواتەوە ، ئەبینێ هەر ئاوە . ئەڵێ : بڕاگەل مای باردەکەی ئاوی پەتی بەئەم زرنگە زرنگەو گێزو گوڵنگەی بۆچی یە ؟

## خەیاڵ پلاو چاتوولی رحمت لە تەوێ

کوردێ لەخێڵ بەجێ مابوو ، نەچووبوە کوێستان لەمەیەکلاوی لەژێر چاتوولێکدا تای لێ هاتبوو دەمی نەدەگەیشتە بەورەکەی کوێسان هاواری کرد جەوالێکم لەدەری رەشماڵ بۆراخەن هاتە دەرەوە رووی کردە شەندرووێ بانگی کرد : ها . ها ئەوە رندووەکەیەتی . وەدەمیم ئۆخەیچ وەدەمیم .

## بارت سەنگینە

دزێ چووە ماڵی منورێکەوە ، بەماڵەکەدا گەڕا کاسە لەئێك . گەسکە کروزەیەکی کەوتە گیر ، خۆ دریش نابێ بەدەستی خاڵی بێتە دەرەوە . ناچار ئەمانەی هەلگرت‌و خاوەن ماڵ بە پێکەنینەوە بانگی کرد ، هەلگرە ، بارت سەنگینە .

ئەویش پێی ووت : هەڵگرینە ، هەڵگرینە ، ماڵ ڕەنگینە .

## بـــە من چی

مەلای مەزبورە ڕۆژێ لە گەڕەکەکەیانا خەتەنە سووران بوو پلاویان ئەبەخشی‌یەوە ، دراوسێ‌یەکی لەلا دانیشتبوو سینی‌یـــەك چێشتیان هانی گەیە بەرماڵی مەلا ، دراوســـــێ‌کەی وتی : مەلا سینی‌یەکت بۆهات ، وتی بەتۆچی ؟ لە ڕاستی‌ماڵی مەلا نەوەستا وتی : مەلا تێ‌پەڕی . وتی بەمن چی ؟

## بادانـــە

نووسەرێکی میسری لەوەحیی خۆیا لەزومرەی زون تورکەکانـدا بوو مابەینی سلطان حمید رایان کێشابوو هاتبوە ئەستەمول . لە بشکطاش ، لەعقاراتی سلطانی خانوویەکیان دابوویە تیا دادەنیشـت ئاموشوی ( بەگ ئوغل ) ی دەکرد لەوێ عادەتە لـــەگەڵ کجە ڕۆمەکانا مواسـ‌ـت دەکرا بە اصطلاحی ئەوان ناوی ( بادانە ) - تەڕاو . خانویش کە سواخەکەی کۆن بوو بادانەی ئەکەن بـە فرچە تەڕاوی ئەکەن . ڕۆژی لە ادارەی عقاراتەوە دوو وەستای لۆزەندەری مل هوور دێن دەڵێن : مســـاعدە بفەرموون هاتووین بادانە ئەکەین ، ئەویش تووڕە ئەبێ ، جنێو ئەدا ، دە‌ ان‌ئەکا ، خۆی ئەچێتە لای باشـــکاتب ئەڵێ : منتان هێناوە هەتکم مکەن : باشکاتب ئەڵێ : چی‌بووە ؟ لەوە زیاتر چی‌بێ ! دوو زرتە زەلام هاتوون تەکلیفی زۆر ناشیرین ئەکەن . ئەڵێ : ناشـیرینی چی ؟

نیهایەت دای پیادەنێ : بادانە . باشکاتیش دەڵێ خۆبۆ تۆ چاکە
میقرۆپ نامێنێ . ئەویش دەست ئەکا بەجوێن . باشکات بۆ گاڵتە
بەپاشا ئەڵێ . ئەویش زۆر پێ‌دەکەنێ .

## دز

لە مانگی ڕەمەزاندا دزێك ماڵێك ئەبڕێ کە ئەچێتە کەڵێن ئەبینێ
هیچی تیانی‌یە دەهۆڵە دڕاوێ نەبێ .

دزیش بەدەستی خاڵی نایەتە دەرەوە ، ناچار دەهۆڵە دڕاوەکە
ئەکاتەملی‌و ئەچێ ماڵێکی تر دەبڕێ ،ئەچێتە ژووری ، خاوەن ماڵ
بەخەبەر ئەبێ تێ‌ی ئەخوڕێ : کوڕە کێ‌ی ؟ دزە ئەڵێ دەهۆڵ
زەنم . ئەڵێ ئەی بۆچ دەنگی دەهۆڵت نایە . ئەڵێ ئەم دەهۆڵەی
من ئێستە لێ‌ی دەم بەیانی دەنگ ئەداتەوە .

## بسم‌الله و هەی جن

مەلایەك دوو میوانی چەقاوەسوو بەزۆرە ی داگیریان کرد
ئێوارە نانیان هێنا هێشتا دەستیان بۆ نەبردبوو مەلا بانگی کرد
قوربانە بسم‌الله بکەن ، وایش بێ من گویم لێ‌بێ ، یەکێکیان لە
بسم‌الله تووڕە بووناتی نەخواردەئەویتر بسم‌الله‌ی‌کردو پاروویەکی
خوارد ، دووەم پاروو دەستی درێژ کرد بەڵام دووبارە بسم‌الله‌ی
نەکردبوو ، خانەخوێ تووند دەستی گرت وتی :لەگەڵ هەموو
پاروویەکدا ئەبێ بسم‌الله بکەی ، ئەویش تووڕە بوو جێشت
مایەوە بانگی کردە ژنەکەی ئەمە بەرەکەتی ناوی خوای تیایەهەڵی

گره هەر چەند چێشت لێ ئەنێی بۆ بەرەکەت لەگەڵ تامانەخێکی لەم چێشتەش تێکە ٠

بۆ سبەی ئێوارە میوانی دوایی هەموو دەرو دراوسێو ئــــەو میوانەی کەلە ماڵی مەلا لەگەڵیابوو لەتەك مەلا بانگی کرد هەریەکێ قاپێ پلاوی چەوری لەبەردەم دانان پێشی وتن نابێ بسـمالله بکەن بانگ کەن هەی جن وەرن ، یەکێکیان وتی : ئابە قورباتان بم هەر لەمەم بۆبلێن ٠ مەلای بەرچاو تـــەنگ شتێکی تری ئەوت برسی مامەوە ٠ مەلایش هەڵسا توند قوڕقوڕاگەی گرت وتی : کەناتەوێ بە بسم‌الله نان بخۆی نایەڵم ئەم نانو چێشتەش بخۆی ٠

## نو مانگەی تـــەواوە

پیاوێکی ساف دەروون ژنێك دەخوازێ خەســـوویەکی عەیــاری جادووکاری دەبێ هێشتا ٣ مانگ بەسەر ناچێ کچە کورێکی دەبێ زاوا شەو بەخەسووەکەی دەڵێت ماشالله ئەو کچەی تۆیە هــەروا زوو زوو کوری بێ منیش دەچمە بەدرخان پاشــا لـــەم خانەدا عەشیرەتێ دێنمە بەرهەم ٠ خەسووەکەیشی ٣ مانگەی وابۆ حساب دەکا هەر مانگێکی بە ٣ ناو هەر ناوێکی بەمانگێك ئەداتە قەڵــەم وەدەڵێ :

ئادار ، بەهار مانگی دۆ      نیسان ، سەیران ، نوخشەی جۆ
ئەو مانگەی بوکیان تیا برد      ئەو مانگەی کچە شووی کرد
ئەو مانگەی کوڕەی تیا بوو      تەواو نۆ مانگ بەسەر چوو

ئەوانەی بۆ هەوێن        سەر لە خەڵك دەشێوێنن

کابراش دەڵێ : حسابی تۆ دروستە .

بەڵام یاخوا هەر لەم مانگانەدا زکی پڕبێ نەك ئەساوی مانگەکانی ترت وابۆ رێك نەکەوێ .

## لــــە ئەستەمول خەو بینین

لە ئەستەمول لە زەمانی پارتی اتحادیو ائتلافیدا هەر حزبێك بهانایەتە سەرکار دەستەی خۆی دادەمەزراند .

ائتلافچی زۆرتریان متقاعدی عەسکەری بوون ، چونکو صادق بەگ میر ئالای متقاعد بوو ، یەکێ لەمانە شەوێ لەخەویا دەبینێ هەرچی متقاعدە عەسکەریەکان بوو خۆمانە خۆمانە بوون بــــە قائممقام . ئەویش ئەچێ دەڵێ : ماشێ منال بەبەرچووبێ ... من خۆم گەلێ لەوانە بەزیاتر ئەزانم کەبوون بە قائممقام .

صادق بەگیش دەڵێ : ئاخر ئەمە خۆ بەزیاد زانیمە نۆی ... دواوە . ئێستاش تەنها لەولایتی موصلداوو قائممقامی ماوە ئەگەر رەزایت بۆ رەوانــدزت بنێرین . نــاچار رەزا دەبێو ارادەی بۆ دەردەکەنو دەڵێ ئەمرەکە بدەن بەخۆم بیبەم . شەریف بــەگ مدیری مەئمورەکان ئاشنای ئەبێ ئەمرەکە ئەدا بەخۆیودەکەوێتە رێ لەخۆشیانا خەبەری دەبێتەوە دەستی ئەکوتێ لەباخەڵی ئەمری تابیە گورج چاوی لێكدەنێوبەزندەخەو دەچێتەوە لای شەریف بەگ دەڵێ : اەرێی خوادا ئەمرەکەم لێگوم بووە وامن ئــەرۆم

## کەرو هەلبەرین

تازە چووبوینە ئەستەموڵ جارێکیان بردینیانە جامبازخانەی ئەسب کەئەوێ قومپانیای وارینە حەیوانانی رام کردبوو، ئەنواعی هونەری بەحەیوانانی کێوی و ماڵی دەکرد : گورگ پووشی بۆمەڕ ئەبرد ، سەگ خزمەتی پشیلەی ئەکرد •

ئەمانە هیچیانم لاسەیر نەبوو ، تەنها گوێ درێژم لا عجائب‌بوو کە هەڵدەبەڕی • ئەیان هێنایە صحنەوە لەگەڵ ئە دومبەڵەکان ئەدانەو چوار پێی و سێ پێی هەڵدەبەڕی • وتیان : ئەمەلەوحی ئاسیان هێناوە لەژێرەوە وەك بەردی حەمام ئاگریان داوە داغ‌بووە سمی گوێ درێژەکەیان تاشیوە نازك بۆتەوە ئنجا بەزۆر کردویانەتە سەر ئاسە داخەکە لە دومبەڵەکیان داوە ئەتاو ئاگری ژێر سمی دەستی کردوە بەهەڵبەرکێ ئێستا هەر چەند دەنگی دومبەڵەك دەبە وادەزانێ ژێر سمی ئاگرە فێربووە هەڵدەبەرێ• کەئەمەیان بۆ گێرامەوە وتم : سبحان الله گوێ درێژ بەکەرێتی‌خۆیەوە جارێ پێی سووتاوە ئێستاش بۆی هەڵدەبەرێ ، ئێمە سەرمان سووتاوە خێراتر بەرەوپیری دەچین •

## بابای عەیار

لەئەسکندەر نامەدا زۆر پارە خۆشەویست بووە،هەموو پادشاهان بە روح لە بابا عەیار ترساون •

پاڵەوانێکی ئەسکەندەریش ئەبێ قەیماس خانی زەنگی ناو ئەبێ
بابا حەزی لێناکا • جارێکیان بابا دەکەوێتە دەریـــاوە نقوم دەبێ
نادۆزرێتەوە • وادەزانن مردووە • ماڵی خۆی سێ رۆژگانــەی
بۆدەکەن•قەیماس خانیش زۆرئەخوا پێ بەکۆڵەکەی چادرەکەوە
هەڵدەپەسێرێو شکی بێ خاڵی دەکاتەوەو ئەڵێ : بەرۆحی بـابـا
بابایش بەگۆرینی قیافەت بەناو ئۆردوگادا ئـــەگەرێ بزانێ کێ
بەتەنگیەوە دێت • کەقەیماس خان بەوشێوەیە دەبینی بێهۆشـــو
دەکاو ئەیباتە دوور بەدارێکدا ســەرەو خوار هەڵیئــەواســێو
ئەیهێنێتەوە هۆشی خۆیو لێی ئەداو ئەپرسێ تۆ کێی ؟ ئەڵێ :
رۆحی بابام •ئەڵێ : بۆخاتری خوا هەرچیم هەیە بۆتۆ لەـــەو
لوقمە نانێ مەمکوژە •

## حەبیب هەورامی

لە ئەستەموڵ هاوشاریەکمان بووحەبیب هـــەورامیـیان پێ
دەگوت لەبدستاندا گۆشە دوکانێکی بوو چشتی ئەنتیکەی کۆنەی
تیا دانا بوو •

تفەنگی فتیلو چەقماقی بەرەوجو ســـارمەو شەمخانو قەرەبینا
تەپلە کۆنی هەوراماننو دیزە و گلێنەی وەو ئەورووپایی ئـــەهات
بۆ سەیر لێیان ئەکری • خۆی ەچشتو مەکەکانی ئـــەنتیکـ
تر بوو •

ئنجا بەرۆژ دراوسێکانی گاڵتەیان پێئەکرد ، ئـــەویش توو

ـەبوو جنێوی ئەدا ، وای لێهاتبوو لەبەر شەرە جنێوهیچی پێ ئەدە.
فرۆشرا • رەمزی بەگی کوری برم افندی خۆمان (یادی بەجێر)
ئوڵاغاسی بوو ، کرا بە قومیسەری بەدستان ، رۆژێ چوومە لای
حاڵی حیب هەورامیم دی ، ئەم هەموو جنێوەی پێ ئەدەن زۆرم لا
گران بوو بەرەمزیم گوت : تەمێیان بکە دەرو دراوسێ باتەمەندە
سەری ئەخەنە سەر ، ئەویش رجای لە دوکاندارەکان کرد وازی
لێبێنن هەموو یەکسەر گفتیان دا کە ئیتر نەیدوێنن ، بەیانی کە
دێتە دوکان بەعادەتی رۆژان بەدەورو پشتی خۆیا ئەگەڕێ کەس
جوابی ناداتەوەهیچ کەس خۆی تێناکەیەنێ • ئارامو ئۆقرەی لەبەر
ئەبرێ ناتوانێ لەبەر خۆیەوە ئەیڕێسیو جنێو ئەدا لـــە هیچ
لایەکەوە وەرتە نییە کار ئەکاتە سەر جەرگی،دوکان ئەپێچێتەوە
ئەچێتە ماڵەوە یەك تەختە لێی دەکەوێ • ژنەکەی دەپرســـێ
ئاغا ئەوە چیە ؟ ئەڵێ : هاوشاریەکانم کوشتمیان • خوێرییەکمان
کەوتۆتە مەجلیسی شهر أمانتیئەوێی کردبەگاڵتەخانەو بدستانیەشی
ئەمێ نیواند ، لەگەڵ دراوسێکانمدا دوو گاڵتەو سوحبەتم ئەکرد
ئێستا بەرەمزییە درێژی وتوە ( بویقوتاژ ) قروقەپیان لێ کردووم ،
هیچ کەس مەرحەبام لێ ناکات منیش وا خەریکە لە داخانا ئەمرم
ژنەکەی چووبوە ماڵی رەمزی زۆری لێ پاڕابووەوە کە هەموو
رۆژێ تێر جنێو بەمێردەکەی بدەن بائەمدا لەدڵ •

# زاوای نـیرمووك

لە هەڵبەستی مەلا کەریمی ناطق و دەستکاری پیرەمێرد

قەڵەم ئینشا کەین . . .    بۆم وەرە جونبوش‌قەڵەم‌ئینشاکەین
بێ‌پەردە کەشفی پەردەی زاواکەین    بۆیاران‌پەردەی‌شایی‌بەرپاکەین
شەرحی زاوایی فلان ئاغا کەین

چەندێ وەك ڕێوی کوناو کونی کرد
خۆی تاس‌و تووس‌دا سەودای ژنی کرد
مەیلی جەوەندەی‌کون نەبنی‌کرد    وەك تەگەمرقەی سەربزنی کرد
کەچی پیاوەتی لێ کەوت‌و نەی‌کرد

بووکیان بۆ هێنا کردیانە پەردە    برا زاوایان لێ‌کرد بە جەردە
بەربووکیان دەرکرد بۆ ئەو نامەردە    هۆدەکە پڕبوو لەبگرمو بەردە
بووکێ تێگەیشت ئاسنی سەردە

ئاغا هات چاکی‌کرد بەکەمەردا    شمشێرە کولەی لەرووی‌سوپەردا
ئانجی‌نەکوژی لەنێچیربەردا    نەی بڕیوەتەی‌کوشت‌کێشای بەسەردا
کەوتە پەلە پەل تا ورەی بەردا

بانگمان‌کرد ئاغا:عارت‌بێ زووکە    شەرمی توانجی‌دایك‌وخەسووکە
بەدرۆ وتی : گوناهی بووکە    بووك وتی بەخوا خۆی نێرمووکە
ئەگینە بۆ پیاو کارێکی سووکە

دەماری حیزەو وجودی سرە    وەك دەفەی بێژنگ پاشەڵی شرە
کەمەری شلەو دەماغی وڕە    بەیان پانۆکێی ژنانە خرە
لای بەبێ تلەوێ ئەم مشتو مڕە

مەگەر لەدواوە هێزیکی بەنێ بەبێ لوورە لەپ مەشکە ناژەنێ
هەموو هەڵبجە بەوێ ئەکەنێ وەرن بیبەنە سەر قاضیبەنێ
ئەم لاکە بەسەر مندا نەگەنێ

شێخ شەمسەی وازەیی

شێخ شەمسەی وازە هەموو ساڵێ هەر رەزێبارێ ترێی لێ ئەسەند ئەیکرد بەمێوژ زستانان ئەیبەشیەوە بەسەر منالاندا • رۆژێ کابرایەك دێتە سەر مشتاخەکە دەستئەکا بە لۆتە خواردن • شێخ ئەڵێ :خۆ بارە ترێی تۆی تیا نییە بۆچ ئەیخۆی ؟ کابرایش ئەڵێ : ئەگەر بت توانیایە بارە ترێم لێ بسێنی چۆن وا بێ پرس ئەهاتمە سەر مشتاخەکەت • مەمنون بن کە هەر ئەمە ئەخۆم •
ئەمجا شێخ ئەفەرموێ بخۆ بخۆ بخۆ • هرخوردنی • دارد •

## لە زەمانی تورکەکانا سلیمانی

لەزەمانی رۆمیدا ئەم شاری سلیمانییە بەهاران چوار جار سەیرانی دەکرد ، هەر گەرەکی خێوەتی لە شوێنێ هەڵئەدا ئەو سێ گەرەکەی کەی بانگ ئەکردەقالەی مزرۆکە بوو ماستاوفرۆش پیاوێکی جەربەزەی ناودار ئەوە حوکمداری سەیرانەکان بووە حاجی محمود لیلی دەستێ جلی زەربەفتی بۆ دروو بوو ، مەحمودی خەفتان چیش کڵاوو خوودەو فۆتەی ئەحمەد پاشای دابوویە تەختێکیان بۆ نابووە سەرشانی چوار پاڵەوان لەسەر تەخت بە

جۆکا هاتبوو ، لەشکرو سوپای سوارەو پیادە بەتفەنگەوە لەدواوە پاڵەوانان بەمیل بازی لەپێش دەمیەوە بە کەش‌وفش لە بەردەرکی سەراوە تێدەپەری‌و دەچوە خەیمەو خەرگای سلطنت‌و لەوێ مجلسی پیاو ماقوڵان لە دەوری •

خوا لێی خۆش بێت ئەحمەدی عەزیزی ئاغا یەکە پیاوو رئیسی بلدیە بوو ئەو ئەم ئارایشەی پێ‌ئەدا • ئینجا یەکە بەیەکە مەئمورەکان ناچار ئەبوون حسابی خۆیان بدەنە قاضی لە ماوەی ساڵێکدا هەرچی کردبوو قالەی مزرۆکە ئەزانێ ئەیکووتایەوە بە چاویاو جەریمەی ( سزا ) ئەکرد •

احمد باشچاوش یەکەئەندامی مجلس ادارە بوو ، متصرف‌ئەگەر ناحەقی لە کەسێك بکردایە خەتای ئەخستە سەر ئەندامەکان کە بۆچی دەنگتان نەکردووە؟ وەسمان بەگی طابور ئاغاسی جەزیمە ئەکردو سیورسانێکی زۆر دەسەندو تمێ‌و نمەقێکی باشی‌دەکردو تەئسیری بۆ ساڵێك دەبوو • لەوە زیاتر دەترسان •

جارێکیان اوضاغا ( بەزەحمەت شادبێ ) وتی : تۆ ئەم هەموو خەڵکەت سەرکوت کردو سەرانەت لێ‌سەندن بۆچ بەئەحمەدی‌برام ناوێری ؟ •

وتی : ئاغا ! من ماستاو فرۆش‌و زڕە بازار ئاغاسی
ناچار لە راستی ئەو کەوتوومە کەساسی

## صوفی جەمشیدی خانەقای مەحوی

مەرحوم ( مەحوی ) بەناوبانگ کەئاثاری فضلی بـــەهیچ مەحو نابێتەوە مجەورێکی ئەبێ ناوی صۆفی جەمشید ئەبێ ، چەن ســـاڵ لە خانەقادا ئەبێ ( مەحوی ) نەقسەیەکی راستی لێ‌ئەبیەو نەکردمـ وەیەکی باشی لێ‌ئەبینی • شەوێکی زســـتان زۆر تاریك ، شێخ ئەرواتەوە بۆ ماڵەوە لە تاریکیدا تووشی زەلامێك ئەبێ لێی‌دەپرسێ تۆ کێی ؟ ئەڵی صوفی جەمشیدم مەحوی ئەفەندی توونـــد قۆڵی ئەگرێ ، ئەگەڕێتەوە بۆ خانەقا ، لە جەماعەت ئەپرسێ : ئەمەکێیە ئەڵێن : قوربان بۆچ نایناسی مجەورەکەی مزگەوتە • ئـەفەرموێ : ئەم پیاوە ١٢ ساڵە لەلای منە هێشتا قسەیەکی راستم لێ نەدیوە • ئێستا چۆن باوەڕ بکەم ئەم قسەیە بەراستی بکات بڵێ من‌جەمشیدم مەلا خالدی کوڕی ئەڵی: بابە ئەوەلەبەر تاریکیدا لێت‌پرسوەپشەی خۆی لێ‌گوم بووە ، ئێستا لەبەر ئەم رووناکی‌یەدا لێی پرســـە : ئەڵی صوفی محمودم •

## بـــە ئەستێرەدا

کابرایەك ، بۆ نەگبەتی بە تێگەیشتوی ئـەزانن ، بە ســەیران لەگەڵ خۆیان ئەیەن بۆ شەقلاوە ، شەوێ کەدادەنیشن یەکێ‌ئەڵێ هەوای ئێرە لە سلیمانی خۆشترە ، ئەو ئەڵێ : من ئێرەو هەولێرو سلیمانی بەیەك هەوا دەزانم • چونکو هەر ئەستێرەیەك لەسلیمانیم دیوە لە هەولێرو شەقلاوایشم وەك خۆی دیوە نـەگۆڕاوە کەوابێ

هەوڵشیان یەکە •

## مــەلای مەزبووره

مەلای مەزبووره رۆژێ لەسەر ئاوێکی وەك ســیروان دەبیی دە کوێر وەستاون بیان پەرێنێتەوە،ئەڵێ : من ئەتان پەرێنمەوەپیاوی ئانەیەکم بدەنێ • کەئەیان پەڕێنێتەوە یەکێکیان دەکەوێتەئاوەکەوەو دەخنکێ ، خەریك ئەبن لێی‌دەن ، ئەڵێ مردوتان مرێ یەکێکتان لێ کەم‌بوەوە بۆ ئێوە باشە ئێوەش ئانەیەك کەمتر بدەن •

## قـــەرزاری

کابرایەکی زۆر زل‌و چەتەولی وەك دێو بەقەرەداغ فێر بووبوو هەموو ساڵێ کەلەگەڵ ئێلدا گەرمیان‌و کوێستانی دەکرد سەرانەی لێ ئەسەندن پیاوێ تەگبیری بۆ کردن وتی : بابەناوی قــەرزەوە کەوایەکی بدەینێ‌ئیتر نایەتەوە سەرمان‌بەراستی هەرکەناوی قەرزیان لێ‌هێنا ئیتر جارێکی تر رووی نەکردەوە ئەوێ •

### حوجرەکەی مــەلا حســینە گۆجەی رەحمەتی

لە حوجرەی مەلاحسینە گۆجەی رەحمەتی ئەم‌خوێند زۆر توونددو قەمچی وەشێن بوو • لەگەڵ دەهاتە ژوورەوە قەمچی‌یەکی کیرە فیلی بوو بەریز دای ئەپلۆستین لە ترسانا ئەمانکردە قریوە رۆژێ منداڵەکان کەسەر مەلامان حەمەگۆجی‌هۆمەرە کوێر بوو تەگبیربار کرد کە دەرزی سنجاقی بۆ داچەقێنن • دەرزی سنجاقیان ئـەهێنا بە ( لوك )ی ئاڵ سەریان خڕ ئەکرد ژنان ئەیاندا لـــە پووشینی

سەریان کەفەدی تێك نەچێ •

من ڕۆژی ٢٠ پوولم بوو ئەو ڕۆژە دە پوولم لای دۆمەژن دابە سنجاق هێنام ، مامۆستا کەوڵو پۆستێکی مەرەزی بوو لەســـەری دادەنیشت ، خەلیفە حەمە سنجاقی هێنا لەدیوی ژێرەوە لـە کەوڵ پۆستی هەڵچەقاند لە دیوە تیـسکەکەی سـەری هاتەدەرێ •

مامۆستا هات خواو ڕاستان ئەو ڕۆژە نەخۆش بوو بـــەنکەنك خۆی‌دا بەسەر کەوڵو پۆستا کە چریکەیەکی کرد ئێمە بە جارێ لەترسا ڕاست بووینەوە سەرپێ‌و بەو هاوارەوە کەزانی ئەمە کەتنی ئێمەیە دەستی کرد بەجنێودان‌و ئێمـە ڕامان کرد بـــەرەکە ت ١٠ دەرزی بەجێی خراپیا چوو بوو نەیتوانی شوێنمان کەوێ •

ئێستا هەموو وردەئەفەندیەکان ئەو عەقڵەیان نی‌یە •

## بــازو چۆلەکە ، یــاری منــاڵان

هەلوور بلوور کە بەریزدادەنیشن‌و لاقیان درێژ دەکەن‌یەکێکیان سەرمەلایە توولێك هەڵدەگرێ‌و بەریز پیایانا دێ :

هەلوو بلوور تەکامە   سـەوزو سوورو شەمامە

کلك‌دارو بێ‌کلــك کامە

قارتی بەرە ، لەجێ زرە ، بۆم بزەرە ، پێ لابەرە

ئەمجا بەکە یەکە پێ لادەبەن‌و هەڵدەستن ، هەڵدەپەڕن ، بانگ دەکەن : کێچێ ماڵی میران خواردینی ، ئەوی بـــەخت هێشتیەوە دەستێکی بەپێ‌وە دەبەستن بەکلکەی دەدەن ، (کلك)ی پیادەکێشن

ئەڵێن : بەنانە سووتاوێکمان ناوێ بزانین لێرە کێیە •

## یاری زل حورتـەکان – بابی ، بابی

دوو کەس ئەبەنە سەر وەستا ، ئەوانی تر جووتەدەچنە لاوە ناو ئەخۆیان ئەنێن یەکێ شێر ، یەکێ تیر ، دوانی تر یەکێ مارە ، یەکێ مارە ، دێنە بەردەمی وەستاکانو بانگ دەکەن : هەبا هەبا • من واتێدەگەم هیا عەرەبییە • وەستا دەڵێ منکم هیـا • دەڵێن : هارتان دەوێ ، یانمار ؟ یەکی یەکێکیانهەڵدەبژێرندوایی بەردێکی تەنك دێنن دیوێکی تەڕ دەکەن ، یەکێ وشکی دەوێ تەڕ هەڵی ئەدەن بەهەوادا • ئینجا کار دەکەوێتە بەختو شانسـی لایەکیان تێدەکەوێ ، یەعنی دەکەوێتە ژێرەوە ، ئەولا سـواریان دەبن ، جارێ وەستا دەڵێ : وڵاختان ناڵکەن بۆ شەڕی ناڵپـارێز ، هەرکەس بێی وڵاخی خۆی هەڵدەبڕێ ناڵی دەکا بەت پەتییەکی زۆریان پێدەکەن دەڕۆن تووشی هەرکەس هاتن دەپرسن : سوار سوارێ یان کەر ؟ ئەگەر وتی : کەر سوار بێ ناچارن ئەولا وەك کەر لە ژێرەوەیە سەردەکەوێ سـوار دەبێ •

### ئەسپەکەی درویش أفنـدی

درویش أفندی لطف‌الله لە هەڵەبجە باشکاتب بوو ئەسپێکیدرێژ داهۆڵی لە شیروان کەمالەیی کڕی بوو لەتەویلەی أوضا بـــەکی کاتب فارسیدا دەبەسترایەوە ، ئەسپەکەی ناو نابوو ، ( بـ • • ) هەرچی هەڵدەستا سواری دەبوو ، وای لێهات کلکیان رادەکێشـا

نەدەجوولا ، ناچار هێنایەوە لای خۆی کەتێر بوو هەچی بەلایـــا دەچوو جووتەی تێئەسرەواند ، زۆرتر لەوانەیشـی کە خزمەتیان کردبوو

ئەو زەمانە شیعری تورکی بـاو بوو مصرعێکی ضیاء پاشـــایان خوێنـدەوە :

( ئەسپی مەند جووتەی پڕەو لـە پڕە )

## بـــازو کەو

لەناو هەموو باڵندەدا جاردراە دەورە دەوری مەهدیبەمشروطیت کەوتە ناو جانەوەرانەوە ، گورگ‌و مەڕ بەیەکەوە ئاو دەخۆنەوە

باز هات بەلای کەوەوە وتی : دەمێکە حەسرەت بە دیدارتم تۆ لەمن گوریز دەکەی وەرە پێکەوە بژین ، کەو وتی : چۆن باوەڕ بکەم ؟ جنسی تیوە بە گۆشتی ئیمە پەروەردە ئەبن ٠

باز وتی : باوەر بکە ٠ کەو چەندی خزمەتی کرد شەوی بـاز برسی بوو رووی کردە کەو وتی : برایەتی وادەبێ خۆت‌لەبەر سێبەرو من لەبەر هەتاو دادەنێیت ٠ کەو وتی قوربان ئەمە شەوە هەتاو کوا ؟ باز وتی های بەدرۆم دەخەیەوە چنگێکی لێگیر کرد کەو کەوتە باڵەفرە ، باز هەڵی‌گرت هات بفڕێ ئاگای لەوەنەبوو کە دەستی عەدالەت نەڵەی تۆڵەی بۆناوەتەوە پێوە بوو ٠ ئەویش‌بە جەزای بەد عەهدی خۆی گەیشت ٠

## بـــه روره ملی

له ئه‌سه‌مول کچیکی به‌شه‌ره‌فم ده‌ناسی خوێنده‌وار بوو هه‌رچی کرده‌وه‌ی سیرین بوو بووی : عودو که‌مان‌و پیانوو حه‌زیان لـــه‌و ده‌نگه خۆشه نایابه‌ی کردبوو به ره‌ویه‌ی ده‌وری جاهلی ئه‌و کچه نازداره بۆهاوتایه‌یان داوه به یه‌کیکی تورەو ته‌وه‌زل‌و ناشیرین‌وه‌ !! کووبه‌ڵه‌ی کووزالك ئه‌مه جی‌یه ده‌سته‌ی اتحادچی کردبوویان به میمونی عسیر ، کچه ده‌سته‌لاتی نه‌بوو ناچار که‌تنی پێ‌کرابوودوای سێ رۆژ پێ‌یان وتبو : هه‌ڵـــه وسڵ بکه ٠ ده‌ڵێ به‌بێ ئـاره‌زوو ده‌سته‌لاتی من‌سواره بوون هێشتا من وسڵ بکه‌م ٠

## شیخانی خومـــان

چل سالّ له‌مه‌وپیش شیخانی خۆمان تجلابـــه‌کیان بۆ رێکه‌وت به فلکیان ئاوت : ولك ٠ ئیستا چۆن بابای باوه ، ئه‌وسا نـــه‌ك ته‌نها له عیراقدا ، له‌رۆمیشدا بـــه‌رزنجه‌یی باوبوو ٠ چاوی چڵکن کاری لێ‌کردن له‌ناو خۆیانا تێك هه‌ڵچوون ، پیاوه ناوداره‌کانیـان بردنه موصل شالیاریش له خزمه‌تیانا ١٣ مانگ ماینه‌وه به‌شه‌ونوێژو پارانـــه‌وه‌و داوێن گرتنی نبی یونس‌و نبی شیت‌و نبی جرجیس رزگار نه‌بوون ٠

مه‌لا کوێره‌ی پیاوی شیخ‌احمدی پلاوخۆرمان له‌لابوو ، فهیمه‌ی حمکوێش دراوسێمان بوو ، چوو له فهیمه پارایه‌وه دوعـامان بۆ بکا ، فهیمه ، خستیه شه‌وێکی زۆر به‌ئاهه‌نگ‌و دوعـای بۆ کردن‌و

وتینێ - سێ ڕۆژی تر ئەڕۆنەوە هیچ سەرەتایەکیشی نەبوو لەپاش سێ ڕۆژە بەهیمەتی فهیمە هاتەوە •

جا مەلا ئەیگوت ئا باوکم ئەولادی کاك احمد بەهمەتی فهیمە رزگار ئەبێ • دەست لە کاری خوا مەدەن کاشکە فهیمەی حمکۆ وومایــــە •

## قالـــەی پیـاوی قاضی

پێش شکیلاتی عدلیە هەر قاضی باوی بوو ، قالەیەك دمبرباشی قاضیان بوو ، جار جار کە پارەی نەبوایە لەبەر قاپی محکمەیەکی گیژۆکەی پارەداری دەگرت ئـــەیگوت هەرچی اعـــلامی هویت وەرنەگرێو اثباتی نەکا ئەو کەسەیە نایەڵن بچێتەوە ماڵی خۆی بەڵکوو ئەو نەبێ ، کابرا هاواری دەکرد : باوکم هەموو دراوسێو گەڕەك ئەمناسن ژنە کوێتم خۆی ئەمناسێ ، خێر ئیللا ئەشیارەسمی اعلامی بدایە ئنجا ئەیانهیشت بچێتەوە ماڵ •

لەپاش قەرنێك کەئەڵێن تأریخ عبارەتە لە تکرر عەینی مادەهاتۆتە ناو : هەندێ وەرەقەی هویت لە منداڵەکانمان داوا ئەکەن لـــەوە نازدار تر ، چشتی ئەوتۆ دەپرسنو شاهیدو شاهد کاری لەســـەر چشتی وا داوا ئەکەن ئینسان رووی نایە بینووسێ • خۆزگەخۆیان تێدەگەیشتن ئەمە چییە ؟

## هارون الرشید و بـەربـەر باشی

پادشاهانی پێشوو بۆ هەموو پیشخزمەتان ناویکیان دانــــابوو :

قەندەدارێ باش دەست شۆر ، خفتانچی ، بەربەر باشی ، مهردارو کیڕ کی •

هارون الرشیدیش دەلاکێکی بوو هەر خۆی حســـاب بوو • رۆژێ باریدار ئەکرێ کابرای لادێی ناری بۆئەخا دەلاك باشی ئەڵێ : کورتانی ئەزەکەیش هی مە ، چونکو من هەرچی بــــە کەرەکەوەیە ئەوەم کڕیوە کابرا دادئەکا پێــداد ئەکا کەس لێی نابیەت ، شکات ئەکا ناپرسن ، ئەچێتە لای خەلیفە ، خەلیفەقسەی دەلاکی لاخۆش دێ ، دەڵێ تۆ هـــەرچی بـــەکەرەوەوە بووە فرۆ شتووتە ، کابرا دێتەوە دەڵێ : بابە پارەی بارە دارەکەم ناوێ بەشەرتێ ئەمە خۆم‌و رەفیقەکەم سەرمان لــەماڵی خەلیفەدا بتاشــی

دەلاك دەڵێ : زۆر باشە ، ئەیانبەم لەوێ یەکی لایەکی سەریان •تاشم‌و دەیانبەمە بەردەمی خەلیفە گاڵتەیان پێدەکەم خەلیفەلێی خۆش دێ بەخشیشم ئەداتێ •

کابرا بە دەلاك دەڵێ : تۆ بڕۆ بۆ ماڵی خەلیفە منیش رەفقەکەم دێنم‌و دێم • دەلاك دەچێتە ماڵی خەلیفــەو کابرایش کەرەکەی دەباتە بەردەمی خەلیفە دەڵێ : قوربان شەرتماز وابە دەلاك باشی لە حضوری ئێوەدا سەری خۆم‌و ئەم رەفیقەم بتاشێ‌و بەو صابونەش کەسەری مشتەری یەعنی ئێوەی پێ دەخوسێنی لەشی کەرەکەمی پێ بخوسێنێ • خەلیفە زۆری پێخۆش ئەبێ ئەمر ئەکا بەدەلاك باشی شەرتت بەجێ بهێنە گۆیت پێتۆ بەو دەڵێی • دارم ــــــە

گورتانەوە گریوە ئەویش دەڵێ : رەفیقی من کەرە • لــەجێی سنداں قوزەڵقورتە •

ئەچێ تەڵاقەکەی چاك ئەکاتەوە

سەردەمێ شطرنجودامە لە هەموو رووی زەمیندا باو بوو،سلطان عبدالعزیز مەراقی زۆری دامەی بــوو، ئێرەش دامە زانی چــاکی تیا بوو ، لە هەموویان وەستاتر مارفی بابە بوو ، عەلی جزار بەگی قائممقامی عەسکەری ئێواران بانگی ئــەکردو دامەزانــەکانی لێ کۆئەکردەوە بە هەموویان دەرەقەتی نەدەهاتن •

لە وەزیرە کۆنەکانی عوسمانی منیف پاشا رسـالەیــەکی بۆ شطرنجو دامە تألیف کردبوو ، کە دوو خصم بەرابەری یـــەك چۆن مبارزەو مصاحبەو ملاعبە دەکەن ؟ ئەوانی سەیرکەرن ئەبێ تەنها سەیر بکەنو قسە نەکەن ، بەلام ئەو ئادابە لە کوورەی ئێمەدا جۆشی نەدەخوارد : یەك ئیستا کە کەسێ یاری دەکا لـــــە هەموو لایەکەوە هەڵئەدەنێ ، ئەوساش یەك ڕوویە بوون هیچ نەئــەوەستان قسەیان ئەکرد ، أوضا پاڵەوان بوو کە حاجی مەحمود ئاغــــــای رەحمەتی ئەیوت : ( دامەنەزان سەعات پێش و پێش ) هەرچی لێی توورە بوایە بێفائدە قسەی هەر ئەکرد • رۆژێکیان نەیانهێشت سەیر بکات تا طەلاقی خوارد قسە نەکا ، لەو ئانەدا یاریـیــەکە هەڵکەوت هەستایە سەرپێ وتی : دەویت تۆ ئەم یاریـیە بکە وامن ئەچم لای مەلا طەلاقەکەم چاك ئەکەمەوە •

ئەم ناوە کەرێزراوە ئیستاش پێی لێ ئەخەن •

## بەزمی مەلا سەعیدو کەنیشتەی جوولەکە

خوا ببەخشێ مەلا سەعیدی خۆمان کەنوکەزانو خـــۆش صوحبەتو خۆش خولقو جوان مەردو دلسۆزی عالەم بوو لـــە هەڵەبجە میوانی من بوو، ئەوسایشە مەحمود پاشا خەریکی رۆیـین بوو ، قەرزو قۆڵەی ئەسەندەوە ، جوولەکەیەکیش پـــەنجا تران قەرزاری بوو نەبو بیداتەوە خۆی کووتابووە ماڵی ئێمە پـــەنامان دابوو • مەلا سەعیدیش شەو حیکایەتی پێدەکرد • شـەوێ لێی پرسی : تۆ ئەچیتە کەنیشتە ؟ ئەڵێ : لە کەنیشتە جێی من لــــە پێشـــەوەیە چونکو باوکم مالووم بوو • ئـــەویش دەڵێ : وەرە جیگاکەی باوکم پێبفرۆشە من قەرزی پاشات بۆ ئـــەدەمەوە • ئەویش ئەڵێ : هەزار جار • بەیانی چوینە خزمەت محمود پاشاو قەرزی جوودمان رێبەرێ کردو هاتینە لای قاضی کەمەلا ئەحمەد رەشی کۆیە بوو ( یادی بەخێر ) درویش ئەفەندی لطف‌الله افندی باشکاتب بوو • وتمان : ئەم جووە جێ کەنیشتەی خۆی بە مەلا سەعید فرۆشتوە اعلامێکمان ئەوێ • قاضی وتی : چۆن چشتی وا ئەووسرێ ؟ موسڵمان چۆن جائیزە بچێتـــە کەنیشتە • درویش ئەفەندی وتی : قاضی افندی خۆ شەرت نییە خۆی بەڵکوو بـــە دڵییا چێ ،خێر قاضی رازی نەبوو ، فەتاح سەرشین کەبە قانونی استدادی پێشینان چاوێکیان هەڵ کۆڵیبوو لە هەڵەبجە قاوەخانەی

دانابو لەپڕ هەردوو هیلکەی گونی، قاضی گرت تانەیگوت : باشکاتب ئامان بۆی بنووسە ، بەری‌نەدا اعلاممان دەرکردو چوینە خزمەت وەسمان پاشا کە قائممقام بوو عەرضمان کرد رەئیسی بەلەدیـەمان بەرەو رووی بخەرەوە هەچیمان بویێ بۆمان بکا ، عەزیزی زاوای میرزا اوضارئیس بەلەدیە بوو دەهۆڵو زوڕنای بۆ حـازر کردین لەگەڵ دەهۆڵ لێدرا تەوەندە خەڵك کۆبووەوە ریێ بـەر ریبوار نەئەکەوت ، سەگیکی گەریان پەیدا کرد ، پەتیان خستە مل ، مەلا سەعید وتی : من گوناهکاری ئوممەتی محمدم ئەمە بە وەکیـلی خۆم ئەینیرمە کەنیشتە لەو شوێنە کەبە اعلام مولکمە عیبادەتم بۆ بکا جوولەکە هاواریان تیکەوت ، دەخیلی وەسمان پاشاو خانم‌بوون تا بە پێنج سەد قڕان مەلا سەعیدمان رەزا کرد قیر سپی بوو ،

مەلا سەعیدیش پەنجا قڕانەکەی خۆی هەڵگرتو باقی دابـە فەتاح سەرشێن چایخانەکەی پێ ریك‌خست ،

## شیخیکی بەرماڵو کابرایـەکی مریـد

شیخیکی بەرماڵ ، بەرماڵو شت ماڵی پڕئەبێ لەمریدو دیاریو ناوبانگی ولایەتو کەرامەتی بەهەموو لایەکدا درزوا ، کابرایەکیش ماڵو منداڵ بەجێ دەهێڵی هەڵدەستێ دەچێتە خزمەت شێخ بەپایە بکا خۆی دەخاتە کەمەندەوە ، ئیتر ئەو کەمەندە ئەبێ لـــەلاقی، نەئالیو گیرۆدە دەبێ ، جار جار خەبەری بۆ دێنن یـا بـــاوکی، مردووە ، یا منداڵی مردووە گوێ ناداتێ ، نیهایەت دەڵێن :

ژنەکەی مردووەو منداڵەکانی بێ کەس ماون • ئنجا ناچار دێتەسەر ئەوە سەرێ لە وڵات بداتەوە • بەڵام یەك پوولی لەباخەڵدا نابێ ، پێ بەجەرگی خۆیدا ئەنێ لە شێخ دەپاڕێتەوە کە دە قرانی بدانێ پێی بچێتەوە •

شێخ دەفەرموێ : نابینی ئەم دەرگایـــە تێی دێ لێی ناچێتە دەرەوە وەك یاری عەودالان خواردنی هەیەو بردنی نی‌یـــە • کابراش بە دڵ شکستی دێتەدەرێ لەکەناری ئاوایی گوێ‌دەرێژێکی ماڵی شێخ دەبینێ بەرەڵایە سواری دەبێ بەرێدادێ ، لەنیوەی رێ کەرە وەك جەزبـــــەی ئێ‌بێ دەزەرێو دەتۆپێ • کابرا دەبینی جێگاکەی زۆر خۆشە : گوێ ئاوەو سەرەرێی قافڵەو رێبوارانە نایکاتە نامەردی کەرە دێرە ئەنێتە چاڵو دوو کێلی بۆ دەچەقێنێ، خۆی لە پایەنیدا بـەکزی‌یەکەوە دادەنیشـــێ • خواو راســتان پیاوێکی زۆر گەورە والی بانگی کردووە بەپەلە دەچێ بۆ (موصل) لە گوێ ئەو ئاوە دادەبەزێ بۆ نان خواردن دەبینێ وا صۆفی‌یەك بەرێشێکی زۆر جوانەوە لەپایەنی مەرقەدێکەوە رابطە دەکـــا • کابرا لێی دەپرسی : ئەمە مەرقەدی کێ‌یە ؟ زیدەوانەکە دەڵێ : زاتێکی زۆر گەورەیە هەموو کارێکی گرتۆتـە ئەســتۆی خۆی و هەموو مرادێك پێك دێنێ •

پیاوە گەورەکەیش کە ترسی قەهری حکومەتی لەدڵدایـە بــە نیەتی مەرام دە لیرەی زەردی ئەداتێ • زیدەوان لە خۆشـــینا

گەشکەدار ئەبێ‌و دەڵێ : مەزرەسەوالی بەندەتە ، تۆ خاوەندی ئە کەرەمە بی قوّرتت نایەتە رێ ، ئەو سەرواو صۆفیش هەڵدەستێ وەستاو کرێکار دێنێ گومەزێکی لەسەر دەکاو خانوویەکیش بۆ خۆی ، منداڵەکانی دێنێ ، خواو راستان ئەو پیاوە گەورەیەش کە چووبۆ موصل بەئارەزووی خۆی دەگەرێتەوە هێندەی تری ئەداتێ زەمەوان لە زیارەت کەران پارەیەکی باش پێکەوە دەنێت‌و هەمیشە دەڵێ باوکم لە شێخ‌و مشایەخ مەدوێن کەری تۆپیویشمان بەفیضە ، دەعنەو ائدا هەر باوەڕ حسابە

## بابای عەیارو شابال شای پەریان

دەفعەیەك ئەسکەندەری دوو شاخە ، دوشمن ئەیگرێ‌و لەسەر چوار کۆڵەکەی بەرز کەپرێکی ئاسمانیلی بۆ دروست دەکاو ئەیخاتە ئەوێ چوار کەناری هەر چوار کۆڵەکە بەتەلی قژقژاوی قولایەدار دەتەنێ ، بابای عەیار هەرچۆنێ دەبێ خۆی دەگەیەنێتە سەر کەپرە لەو دەمەدا شاباڵی شای پەریان دەنێرێ ئەسکەندەر بدۆزنەوەو بیبەن بۆ کێوی قاف ، بابایشیان رەدوو دەکەوێ‌سواری کۆڵی پەرییەك دەبێ‌و دەچنە شاری پەرییان ، شاباڵ شـــــا صوحبەتی بابای لا خۆش دەبێ جەواهـیر سورمەی سلیمەی ئەداتێ کەهەر گاهێ چاوی پێ برێژێ کەس نایبینی ، بابـاش دەی هێنێ بەچاویا دەچێتە گوزەری جەواهیر فروشـــان جانتای عەیاری پڕ دەکا لە ئەڵماس‌و مرواری‌و زمرووت‌و یاقووت‌و لەعل‌و

پیرۆزە . گەوهەر فرۆشەکان ئەبینن هیچیان لە قاصەدا نەمـــاوە

تێ دەگەن ئەمە کەتی دزی چاو ڕێژراوە ، دەرگای بە دەســتان

دادەخەن‌و ئاگری دارەتەڕ دەکەنەوە دووکەڵ هێندە ئاو لـەچاوی

بابادێنێ کل پیوە نامینێ . ئینجا دەردەکەوێ دەیگرن تـیـرو پـــر

دەیکوتن . کلتوری لە باخەڵ دەردێنن ، دەیبەنەوە بۆ شاباڵ شاو

نارەزایی خۆیانی بۆ دەرئەبرن کە جارێکی تر سورمەی ســلیمانی

نەدا بەنابەکار . بزانین وایە سورمەی سلیمانی نادەن بە نائەهل .

أو هو .

## حەزرەتی موســـا و پیاوی خوا

رۆژێ حەزرەتی موسا ئەچێ بۆ کێوی طور نیازی ئـەبێ دەم

بکاتەوە خوا فەرمووی ! جارێ بڕۆ بۆ شار دۆستێکم هەیـــە لێم

دلگیرە ئاشتی بکەرەوە . ناونیشانی دۆستەی بۆ هەڵدا . ئەویش

هات لەبازارا دۆزی‌یەوە تێ‌ی فکری والەبەر دووکانی بـەقاڵێك

وەستاوە ، بەقاڵ خەریکە سەبەتەو مرکانەو قیرتەبەقی خواردەمەنی

لە زوورەوە دەردێنێ ، دوکان دادەنێ مرکانەیە هەنگوینی هێنایـە

دەرێ تاچووەزوورەوە چنتی تربێنێ دۆستەکەی خوامەرکانەکەی

خستە ناو قوڕەوە شکاندی هەرچی تیابوو رشتی‌و لە لیتەی‌بازاری،

وەك ئەمرۆدا پێ‌ی لێ‌خست . دەستەو دایەرەی بەقالی لێ کۆبۆوە

بەئەسکوێ هەموو سەرو گویلاکان شکاند . لەوێ رای کردچووە

گوزەری بازرگانەکان . حاجی أوضا کوتیرەیەکی ناومشکینەیتان

بۆ هینابوو نەیهێشت. لێی بخوا لە دەستی سەند دیسان ئەویشی خستە قوڕەوە و بەهەردوو پێشێلای • لەوێش ئەوەندەی تری‌یان تێهەڵداه‌ئنجا چووبۆ بەلەدیە رەئیس تەنهایەك کوڕی‌پێ‌رەوکانەی بوو ، رازاندبوویانەوە بەباوەشی لەلەوە بوو دەیهێنا بۆلای‌باوکی کوڕەی گرت سەری نایە بن‌باخەڵی خۆی‌و تاســــاندی هێندەی نەمابوو بیخنکێنێ ، لە دەستیان رسگار کرد ، لەوێ زۆرتری شەق خوارد • ئنجا رووی کردە دەشت موسا بەشوێنیا رۆیی ، بانگی کرد : موسا مەیە • دۆستی خوا ئەمەیە : هەنگوینی بەقاڵ ماری تێ تفی‌بوەوە بۆئەوەی خەڵق نەیخوات خوا بەمنی رشت • کولێرەی بازرگان باشی ژنە کۆنەکەی زەهری تێ‌کردبوو بەمنی خســـتە قوڕەوە• کوری‌رەئیس چاوەزاری لێ‌کارکردبوو زەهری‌چاوەکەی بەبن باخەڵی من جەلمزی • دۆستی خوا بەمنی هەر تێهەڵدانە • تۆیش ئەگەر دۆستی خوا بوبتایە کە پیاوەکەت کوشــت چوار شەقت نەخوارد •

## خانم خاس‌و مەیــاس

لە گەرەکی کاتێــکان ئافرەتێك دەبێ ناوی خـــانم خـــاس ، بوکێکی دەبێ مەیاس • بووکێ نەوسن‌و خەسوو چرووك • هەمو چشتێك لەژێر کلیل‌و قفڵدا ئــەبێ • رۆژێ دراوسێ لەســـەر تەندووری ئەوان نان ئەکەن ، مەیاس ئەچێ لەواشەیەکیان پێ‌دەکا بەگەرمی دەیهینێ بیکا بەچنگاڵ • تێ‌دەفکرێ خەسووی‌کووبەڵەی

رۆنی کردوە بەهەیوانلو هەیوانیش تازە سواخ دراوە • ئــەگەر
بەسەر سواخەکەدا بڕوا شوێن پێی دیارە • کتوپڕ فێڵێکی هـات
بەخەیاڵدا تڕیخەسووی پێبڕی گوێدرێژێ لەحەشەبەستڕابووەوە
سواری گوێ دریژ بوو چوە بەرسنگی کووپەڵە ڕۆن چنگیٚ رۆنی
دەرهێنا نایەسەر لەواشەکەیو گەڕایەوە چنگاڵی خۆی خــوارد
کەری نەبەســتەوە خۆی چوە ســەر تــەنوور دەستی کرد بـەنان
کردنەوە • خەسووی هاتەوە تێفکری کەر چۆتە هەیوان بــەر
کووپەڵە رۆنەکە • کە کووپەڵەی داگرت روانی بــــە چنکی
ئافرەت ای‌ێی دەرهاتووە وتی : ئای هەرەس بەماڵم •

شوێن سمی کەرەو چنگی مەباســـێ

من لــەم کەتــە وا سەرم ئەماســـێ

## سیانزە سوارو سیانزەی مانگی سەفەر

دەوری عوسمانی کە موصل ولایەت بوو • تیرە لـەژێرحوکمی
ئەویدا بوو • لە خزمەت شێخ‌مصطفای نەقیبدا ئــەچوین بۆ موصل
سیانزە سوار بووینو سیانزەی مانگی سەفەریش بوو • هەرچەند
هاوارم کرد سیانزە نەحسە وتیان : نەحسی سیانزەی ئێمە بــــە
سیانزەی سەفەرەوە ئەڕوا •

گەیشتینە چەمچەماڵ لە ماڵی رەشیـدی قــادر هێندەر بووین
قائمقام برایم بەگی هاتە لا دانیشت • تەلغرافێکیان دایە دەســت
خوێندیەوە هەڵـسا رۆیی • دەمو دەست ئەحمەدی کوێخا مارفـهات

وتی . قائمقام عەزڵ بوو • من وتم : ئەمە یەك • محمود أفندی
ماڵ مدیری بوو وتی : ئەم یەکە مەعنای چی‌یە • وتمان سیانزەین و
سیانزەی مانگیش هەڵساوین • وتی : کەوابوو نحوسەت بۆخۆتان
نی‌یەو بۆ ئەوەیـــە دەی‌بینن • خوا من بپارێزی • راســـتی کرد
ئەویش ئەنگێورا • لەوێ‌وە بەسەری ( شـــوان ) دا رۆین لـــە
( گولم‌کەوە ) شین‌و شەبۆر بوو کوێخا رەشك هات بەپیرمانەوە‌کلا
هەموو پشتی دەم‌و چاوی روو شا • ئێوارە چوینە ماڵی صادق‌ئاغای
دێ‌یەکە زەلامیکیان نارد کرشە بۆ ولاخەکانمان بێنێ • ملرێوەدا
مرد • رەسوڵ ئاغا چای بۆلێنایین ئافمی چای تازەیان کریبوو هێشتا
ئاوە کووڵیان نەکردبوو لە هەزار بێشەی هێنایە دەرێ هەر چای
کردە پیاڵەو پیاڵە نەقی ئێوارە نایان هێنا سینی‌یەك بەســەر حاجی
صالح چزڵیکدا رژا شلە هەموو سنگی سووتاند • لـــە ( گوێر )
لە بواری نەهری ( نەمروود ) پەرینەوە صالحە زلەی قەتـــارچی
کەوتە ئاوەوە ئەسپەکەی خنکا •

ئەمە خوێ‌ی چێشتە • ئەواو لەبیرم نەماوە چیمان بەسەر خەڵك
هێنا • ئێستا رەنگە مەراق بکەن ئەم سیانزە سوارەی کەیەکێکی
لە دوانزە سوارەی مەریوان زیادە ، کێ‌بوون ؟ باهەندێکتان بـۆ
هەڵدەم : ۱ ـ سەر دەفتەر خۆم ۲ ـ حاجی صالح چزڵێك
۳ ـ ئەحمەدی مجە سێ‌لاق ٤ ـ سەعید بەگی سلیمان بەگ
٥ ـ حاجی سەید حەسەن ٦ ـ شێخ عارفی قازانقایـــە ۷ ـ مەلا

کوبرەی پیاوی شێخ ئەحمەدی شێخ رەسول ٨ ـ کاکــە وەیس

٩ ـ وەیسی افندی • ئنجا هەرچی ئەحسیەکمان بوو دامان بــــە ئاوی زابا • خۆمان پاك کردەوە لەلاوێ دەنگی دەهۆڵو زورناهات لامان‌دا لە دێیەك شایی بوو • نەقیب دابەزی جلی حاجی‌صالحی لەبەر کرد بۆ ئەوەی نەیناسن سەیری شایی بکا • سەید حەسەن متعصب بوو لەگەڵمان نەهات • لەکەناری ئاوایی لەگەڵ ســـەعید بەگدا مانەوە • چوینەسەیری شایی • دەهۆڵو زورناو کچەعەرەب پەنجەی یەکیان گرتبوو رەقصیان ئەکرد تێر سەیرمان کردشێخی ئەو دێیە وتی : الا دەبێ بێن قاوە بخۆنەوە وتمان درەنگە بەزۆر بردینی •ئێمەیش حاجی‌صالحو ئەحەی مچە سێ‌لاقمان لەسەرەوە دانا • من‌و نەقیب وەك خزمەتکاری ئەوان بەپێوە وەســـتاین • قاوەیان هێنا ، قاوەچی سەیری ئەوان‌و ئێمەی کرد • رووی کردە شێخ بەئیشارەت وتی : قاوە بەکێ بدەم • شێخ هەڵسا پــەلی حاجی صالحو ئەحمەدی گرت هەڵی ســـاندن توورەبوو : ( فوت یاالله ) هات پەلی شێخی گرت وتی : یاشێخ شایی برایەوە لەجێی خۆت دانیشە پیاوی ساختە هەر دەردەکەوێ

## خوایش لەسەر ئافرەت ئەکاتـــەوە

شێخ سەعدی بالاتەرانی بەکفتەی نرکەو بەتوانج لەگەڵ خوادا لە کفر ئەحمەد کەمتر نەبوو • ئافرەتێ لەکانی‌میرانەوە هاتبوو لە کانی‌پانکەی لای موان چایخانەیەکی کردبوەوە پارەیـــەکی‌زۆری

دەست کەوتبوو • ئەویش کەوتە سـەر سـەودا وتی : ئـافرەت کاسبی پێبکریت،من بۆچی دانیشم؟منیش لەسەر رێدا چایخانەیەك دادەنێم ، بەرگردی بالآن تەران هەوادار ترەو ئاویشی سازگارترە مانگایەکی بوو فرۆشتی چایخانەیەکی پێدانا • یەکی ئافرەتەکەی خست .• تومەز ئافرەتەکە بەچاوشی مەخفەرەکەی موانی دەنـازی خەبەری لەمەلا دا کەشەو چەتە لەچایخانەکەیا خۆیان ئەشارنـەوە قیر مەلایان گرت • ناردیانە هەڵەبجە • هاواری کرد : باوکە سێ ساڵە چەتە نەماوە ، وتیان : تۆ خەریکی کۆیان ئەکەیتەوە • وتی : من بمتوانیایە چەتە هەڵسورێنم یا متصرف ئەبووم یا مبعوث لەسەر ئەو قسـەیە قەدری سەرو گوێلاکیان کوتایەوەو بەرەلایان کردکەوتە رێ بێتەوە لەرێ خەبەریان دایەکەخوا بارانی باراندو چایخانەکەی تۆ نەیی •

وتی : من خۆم ئەزانم کە خوایش لەسەر ئافرەت دەکاتەوە ، أنشاالله هەرچی پیاو هەیە دەبنە بەندی ئافرەت تاوەك ئادەمی باوە گەورە مانمان بەسەر بێنێ • هەروا بەرێدا دەروا ماندوو مردوو لەبەر خۆیەوە لە عەلەهی خوا ئەدوێ شمری سوارە ، تیفکری ئۆتوموبیلی هات رەنگی بریتانی وەك باڵی ( کەڵـــەبەك ) پیاوێك‌و ژنێك ، أمما ژن کەتەماشای کرد هیچ ماندویەتی نەما وتی خوایە تاتێستە هەر عەکسی منەوە معاملەت کردووە ئێستا ئەمجارە وا بکە ئەم ئافرەتە بڵێ : ئەم رێبوارە ماندووە ، ئێمەش ئوتوموبیلی خاڵیماز

پێیە پاسواری کەیێ گوناهە • منیش هەم ماندوێتیم ئەحەسێتەوە و
هەم بەبادەی چاوی ئەو نازدارە سەرمەست ئـــــەبم • ئوتومۆبیل
فرکەی کردو تیەری لەراسنێ پردی ( دەڵین ) چەقیەقورزگاری
نەدەبوو • بەشوفیرو بەخاوەند ئوتوموبیل مەلایان بـــــەزۆر هێنا
حوکمیان لێکرد پاڵ بە ئوتوموبیلەوە بنێ تابەهەر حاڵێ بوو لـە
قوڕ هاتە دەرێو ئەوان سوار بوونو مەلاشیان بە هەناسە ساردی
بەجێ هێشت •

بـــــەزمی وەستا نـاجم

وەستا ناجمێ بوو هەرچی ئیشێکیان ئەدا بەسەرا ئەیوت : وەستا
ناجم تا ئەم ناوەی بەسەرا بڕاو ، ناوی نرا ، نانو دۆی بڕ •لێرە
کەس ئیشی پێنەدەکرد ، دایە تەممەڵی هێجگار لە کەڵك کەوت •
تا رۆژێ قافڵەیەك لە سلیمانیەوە بۆ ئەستەموڵ ئەچون مەصرەفیان
خۆڕایی بوو ، وتیان با ئەویش بەرین لەوێ بیخەینە تەمەڵخانەوە
بردیانە اُسکدار خستیانە تەمەڵخانەوە و دوو مەجیدیان دایە •
رۆژێ مدیرێ بلیتی پیانقۆی هێنابوو ، پارەدار ئـــــەیان کـــڕی ،
ئەویش دوو مەجیدیەکەی پێداو چارەك بلیتێکی وەرگرت‌حەوت
هەزار لیرەی بۆ دەرچوو • هاتەوە بۆ سلیمانی ، لەلادێ هەندێ
زەویو زاری کڕیو ژنێکی هێناو مەڕو مانگایانپێکەوە ناوجونیان
دابەستو دەغڵو دانیان کرد • ژنەکەی حوکمی لێدەکرد بەرۆژ
بچێ بەسەر وەرزێرو کێشەی خەرمانەوە بوەستێ • بەژنەی وت:

نازانی من نلوم وەستا ناچمە ؟ ژنەکە وتی : کەواتە تۆ لەماڵەوە
چێشت لێنێ من ئەچمە سەربەرشتی دەغڵو دان ٠کابرا وتی :
باشە مەنجەڵی تەسلیم کرد وتی : دوکولێو بکە ٠ برنجی بۆ
شتەوە و بۆی دانا ٠ گوێرەکەیەکیان بوو کردبوویانە سەربان
ئەلەوەڕا ، وتی : چاودێری گوێرەکەکەش بکە نەکەوێتە خوارەوە
کابرا دۆکەی کردبوو مەنجەڵ تێکی ئەدا ، ئایشیلی دراوسێیان
هات وتی : وا گوێرەکەکەتان نزیك گوێسوانەکە ئەلەوەڕێ
ئەکەوێتە خوارێ ٠ وتی قوربانە ئایشیلی ٠ ئەو گوریسە بەرە
بیخەرە ملی لەکلاو ڕۆژنەوە سەری گوریسەکەم بۆ داپێڵەخواری
ئەیگرم بانەچێتە گوێ بان ٠ ئایشیلی خۆی ڕۆیی کابرا دەستی بە
کەوگیرەوە گیرابوو سەری گوریسەکەی بەست بەپێی خۆیەوە ،
زۆری پێنەچوو گوێرەکە خۆی کوتا بۆ گوێسوانەکەو زرم بەر
بوەوە سەری گوریس لێرە پێی کابرای هەڵبری لەبن میچیتوند
کرد ، لەولایشەوە گوێلك ئەبۆڕاند ، ناچم ئەیناڵاند ، تاژنە
هاتەوە ڕوانی گوێلك هەڵواسراوە وەختە بخنکێ ، چەقۆی لە
گوریس نا گوێلکی داگرت لە ژوورەوە زرمە هات ڕای کرد تێ
فکری مێردەکەی سەری کەوتۆتە ناو مەنجەڵو دوو کولیوەکەی
قلپ کردۆتەوە هەموو سەرو چاوی پێستی داماڵاوە ڕاستیکردەوە
بەسەرو گوێلاکەوە بردیە دەرەوە پێنیشانی خوای دا وتی :
قوربان ! بینایی چاوان کەسی تر نەبوو ئەم یاصیەی بەێتێ ئەمە

نەبێ کە بە رۆژ ئەمە هونەریەتی و شەوشینا جولێتەوە •

پارە بۆ هەتیو نەك بۆ هەتیو باز

پیاوێکی جیهان گەر دیدەی شاران دیدەمان بوو ( مەرنەمووکە) یان پێ دەگوت ، سەر گروشتەی خۆی دەگێرایەوە : وتـــی : جارێکیان لە شاربازێڕەوە دەهاتمەوە لە وردەدوانانی کۆیژە تووشی کوێرێکی حافظهاتم لە پیتاکی گەدایی ئەهاتەوە منداڵێکی بچکۆلـە دەستی را دەکێشا لە بەردێ هەڵ ئەنگوت کەوت ، دەستم دایـە بن باخەڵی هەڵم سەندەوە لە بن باخەڵیا دەستم کەوت لەپڕیاسـکە یەکی قورس هەمووی پارەبوو بەبن باخەڵیا دوریبو • هەندێ رویین وتم مەلا من کۆنە جەردەم پارەی تالانیم زۆر پێ خۆشـە دەستم لە پارەکەت کەوتوە ، پارە شیرین و تەیتان بەفریوهەردوکیان هانە هانەم ئەدەن تۆ رووبەوە بکەم • تێفکریم مەلا لێم بووبـە واعظ بەئایەت و بەحەدیث هێندە ترسی نایەبەرم کە نەوێرم رووتی بکەمەوە • ئەیوت : هەرچی گوناهێك ئەکەی بیکە • شــــەراب بخۆرەوە ، ئەمە بکە ئەوە بکە ماڵی دەوڵەمەند بــــەرە ، بــەلام هەر تەفەقەکاری ماڵی کوێران مەبە • • وتم : مەلا بیستوومەئەم منداڵە لەگەڵتەو رابەرتە دەستی بۆ درێژ ئەکەی • وتی : درۆیـە منیش لە منداڵەکەم پرسی : وتی مامەکیان بەقوربانت بم بــەخوا راست ئەکەن • مەلا تووڕە بوو وتی : هەتیو قەت بەنارەزایی بووە پارەت ئەدەمی • لەم سەرەوە هەتیو مارە ئەکەن،لەئاریشدا باوە •

وتم : مەلا من بیستومە ئەوە عەرشی یەزدانی بێئەلەرزێو لە جەردەیی خراپترە • وتی وانی‌یە • هەرچی بەخواهیشی هەردوولا بێ دروستە • جەردەیی زۆرداری‌یەو منیش چاوم کوێرەو بەپیناك گوزەران ئەکەم • سێ مانگە ئەسورێمەوە ، بنی پێم بلۆقی کردووە پیاوی جەردەش لە ئاقاری کوێرو هەزار زۆر بەخشندەن ئەشێ تۆ پێم بەخشی •

وتم : مەلا وازم لێهێنای ، هاتین تاپێچی گلەسپی • وتم : مەلا شەیتان ئەمجارە ئەڵێ تۆ مەلات ترساندووە ، دڵت ئێشاندوە ، ئاشتی بکەرەوە ، هەرچیت پێیە بیدەرێ • مەلا وتی:بەخوا هەرچەندێ شەیتانیش پێی وتبی بەڵام نەسیحەتێکی باشە پیاو ئـــەبێ جـــار جاریش بەقسەی شەیتان بکات • کەوای وت کوبڕ تێکمەوە پێچا پارەکەم لێسەند جوار پەلیم بەستو منداڵەکەم دایـە پێش خۆم وتم شەرت ئەکەی ئیتر ناموسی خۆت بە هەتیوبازان نەدۆڕینی • خۆیشم قەرارم داوە ئەچەمە بەر خەیاتی • وتم : کەست هەیە • وتی : دایکێكو دوو خوشکی هەتیوم هەیە من بۆ گوزەرانی‌ئەوان هەموو شتێکم گرتۆتە ئەستۆ•کەوای وت هەموو پارەکەی کوێرم دایە وتم : مەلا کوێرە خۆی ئەژیەنێ ، تۆ ئەمە بکە بەدەستمایـە پارە بۆ هەتیو نەك بۆ هەتیو باز •

## نەخوشیکی ســـەیر

دکتور : کوێت دێشێ ؟

نەخۆش : دکتۆر حاڵم زۆر خراپە ، وەکوو پشیلە کەئۆبەتم بوو
دەمم وشك ئەبێ • چۆن سەگێك تینوو ماندوو ئـەبێ ،
منیش وازبانم دەردەکێشم و لێوی خۆم ئەلێسمەوە • کە
حەرارەتم بوو ئیشتهام زۆر ئـــەبێ ببــەقەد گورگێـك
برسیم ئەبێ •
دکتور : عەزیزم تۆ بەسەهو هاتویتە لای من  راسـتو رەوان
هیچ رامەوەستە بچۆرە لای بەیطال ، دەرمانی ئەم نەخۆشی تۆیە
لە بەیطاڵخانەیە

## دەروێش عەزیزو پشت ماڵەی جاف

پشت ماڵەی جاف دروێش عەزیز ناوێکیان بوو ، تۆبەکاری دابویە
کاللەی شێتی کردبوو ، هەرچەند هەڵسانو دانیشتنی لەســەرخۆو
بەئاداب بوو لەگفتوگۆدا تەواو بوو • بەلام خولیایــەك چووبووە
کەللەیەوە لێی بوو بوو بەراست ، گوایە خوشکێکی زۆر جوانو
نازداری بوو سلطان عبدالحمید شۆرەتی ئەو کچەی بیـــستووە ،
ناردویە خواستویەتی • ئێستا ئەو خوشکەی بەدیاری زۆر شـــتی
نازامی بۆ ناردووە • عوسمان بەگی جاف خەبەری زانیوە حەمەی
عەزیز بەگو سلیمانی شانەو عەزیز بەگی ئەورەحمان بـــەگی
ناردوە هەرچی دیاری‌یەك کە بۆی هاتوە تـــالانیان کردووە و
بردوویانە بۆ ماڵی خانم • ئەم کابرایە تێلاو تێلو خێلەو خێــڵ
دەسوورایەوەو ئەمەی دەگێرایەوە•رۆژێ ماڵەگەورە لەگوێ چەمی

(زەلم) هەلی دابوو دەرویش عەزیز دێت بۆ لای خانم شکاك لە وەسمان بەگ ئەكا ٠ وەسمان بەگ لە كابرا تووڕە ئەبێ بـــە دزی خانمەوە را دەسپێرێ دەروێش عەزیز سواری ئێـتریكـــی تۆڕی جافی دەكەن و بە گوریس باش شەتەكی ئەدەن و دركێك ئەخەنە بن كلكی ئێسترەكەوە بەرەللای دەكەن ٠ ئەو ئێـــسترە تۆرە بەناو رەشمال و دەواری مالە گەورەدا ئەمەندە هەلدەتیزێنێ تاكو دەروێش عەزیز فڕێ ئەدات ٠ أمما چۆن فڕێدانێ كابـــرا خوێنی لووتی بەردەبێ تا بێهۆش دەكەوێ ٠ پاش چـــەندێك بۆسوی پەڕۆی شین بە لووتیا هەل ئەدەن كە دێتەوە هۆش خۆی و چاو ئەكاتەوە شایەتمانێ دێنێ خولیاو و خەیال هـیچ لـــــــە كەللەیا نامێنێ و ئەبێتەوە بە پیاوەكەی جاران خۆزگە ئەم شارەیش وەسمان بەگێكی تیا پەیدا ئەبوو بۆ ماخۆلیاداران

مەرنەموونە كەیلێ شـاپلێتە دەر كونەیلێ

وەستا هارونی زەرەنگەر بور سنعەتكارێكی زۆر وردو بـــە سەلیقە بوو بەلام مسقالی چارەكێكی ئەدزی ٠ ئافرەتێكی ئەوسەرە لە مالە دەولەمەندێكا كارەكەر بوو بەرچاوگەیـــــەكی دزی بوو بردبوویە لای وەستا هارون بۆی ساغ بكاتەوە دە تارانی دابوویە ئەوی تری دزی بوو بۆ خۆی ٠

ئافرەت داخ لەدل بوو داوای لە قەدەم بووشوی بەخێسە ناوێكی لای خۆیان كرد كەتۆلەی لە وەستا هارون بۆ بكاتەوە ٠ تا ئەم

کەتن‌و بەتنە کرا هارون مردو بردیانە گۆڕە جوولـــەکە ناشتیان هەر ئەو شەوە قەدەم چوو لەگۆڕ دەری‌هێناو لنگەو تلوور سەری چەقاندە گۆڕەوەو شاپلیتەیەکی تێ‌بڕی ئاگری پێوەناو رۆیی • لە گەرەکی جوولەکانەوە روانیان گۆڕی هارون نوری لێ‌بـــەرز ئەبێتەوە • هاواریان کرد : نورەیلێ ، نورەیلێ • مالوم بـــەدوعا خوێندن چوو روانی شاپلیتەیە بانگی کرد : ( مەرنەمو کەیلـێ ، شاپلیتە دەرکوونەیلێ ) سبەینێ هاتن شکاتیان کرد حەسەن ئـاغا طابور آغاسی بوو وتی : ئەوانەی ئەمەیان کردووە لـەجوولـەکەی مردوو بێ مەزیەتن •

## شـــانس

خلەی بلەی مەولود کەرەوان بوو رۆژی خشتی بۆ مـــــالی نایازندە ئەکێشا پارچەیە فەرشە کۆنی لەسەر تەندوورەکەیاناچاو پێ‌کەوت کەگلنازە دالکەفیچانی نان‌پێوەدەر لەژێر خۆی رادەخست وتی ئەمە بۆسەر کورتانی کەرە قیتەڵ باشـــە • داوای کرد • یایە وتی : ئەوە کەباپیرە گەورەم لەدەرگەزێنی هەمەدانەوە هاتۆتە قەلاچوالان ئەوە فەرشی بووە بەرە بەرە کەم بۆتەوە ئەم پارچەیەی ماوە ، یادگارەو ئەنتیکەیە دڵم نایە بیدەم بەکەس • خلە وتی یایە ئێوە دەستە فەرشتان بەخەلکی بەخشیوە ، باکەرەکەی منیش یەکێ بێ لەوان ، بەخوا کەرەقیت سبڵە نی‌یە بەمستێ‌جۆ بارێ ئەکێشێ یایە پێ‌کەنی‌و وتی : ئەویش بۆ کەرە قیت • ئەمما توخوا بـــــە

فیرۆیمەدە هەرلەویَ پارچە فەرشی خستە سەر کورتانی کەرەکەی گێزو گولنگی بۆ تازە کردەوە ٠

رۆژێ وتیان : موسیو تەرتاس هاتووە بۆ فەرشی کۆن ئەگەرێ خلەیش بەکەرە قیتەڵەوە خۆی دایە فەدی ، کابرا تێفکری وا چشتی بەسەر کورتانی کەرەکەیەوە ئەدرەوشێتەوە وەك شەبەندە بەرۆژ ، بۆی شێت بوو ، هەڵسا سەیری کرد وتی نایفرۆشیت ٠ وتی خێر ئەمە بەرەکەتی سەر قەتاری کەرمە سەرزینی رەخشی رۆستەم بووە ٠ کابرا وازی لێنەهێنا تابەسەد تمەن لـــە دەستی دەرهێنا ٠ خلە خدری زیندەی لێپەیا بووە ٠ بەو سەد تمەنە بۆ بەخدر بەگی سیناجیان ٠ یانازەندی خاوەن فەرشە کۆنەکەش وردە وردە کەم دەست بوو ، خدر بەگ رۆژی توورەکەیە پارەی بۆبرد لێی قبوڵ نەکرد ٠ وتی : بیستوومە غەریبێکی نەخۆش دراوسێی گەورە ماڵێ ئەبێ ٠ سەگی دەرماڵی ئەو گەورە ماڵە قاپی چێشتی بۆ دێنێ ٠ قاپەکە زیو دەبێ ٠ نەخۆش چێشتەکە دەخوا قاپەکە هەڵدەگرێ ٠ چاك ئەبێتەوە ئەیفرۆشێ ئەیکا بەســـەرمایە زۆر دەوڵەمەند ئەبێ خاوەند گەورە ماڵەکەش حکومەت تالانی ئـــەکا هیچی نامینی ٠ ئەویش هەڵدەستێ پارەی بۆ دەبا ٠ ئەڵێ : ئـــەمە پارەی ئەو قاپە زیوەیە کەمن نەخۆش بووم سەگەکەت بەچێشتەوە بۆی هێنام ٠ ئەویش ئەڵێ : چشتێ سەگی دەرماڵی من بەخشیبێتی من چۆن قبوڵی ئـــەکەمەوە ٠ ئێستایش من ئەوی بەخشـــیومە

## کچی پاشـای کشمیرو کوڕی شای قـهڵاچوالان

پاشای شاری کشمیر سێ کچی دەبێ هەرسێکیان جوان دەبن٠ هیچکار کچه بچکۆلەکەی ناوی جوانی بەهەموو شاراندا ئـــــهروا شوو بەکەس ناکا ٠ لەخەودا دڵبەستەی کوڕی شای(قەڵاچوالان) دەبێ کورەیش خەوی پێوە دەبینی ٠ بەدەرویشیو تەنها باڵەروو دەکاتە شاری دڵدارەکەی ٠ ئەگاتە شار کەس ناناسێ تووشی ماڵێك دەبێ دەرگای کراوەتەوە٠ئەچێتە ژوورەوە ئەبینێ پیاوێکی نوورانی لەبێ چاڵی جۆڵایدا خەریکە جاو ئەرێسێ ٠ چوو دەستی مـاچ کردو ئەویش ناوچاوانی کورەکەی ماچ کرد بووبە جۆڵاو زنە جۆڵا منداڵی نەدەبوو زۆری خۆش ئەویست ٠ دوایی چەنـــدێك لای دایکە جۆڵا زن درکاندی کە بۆ کچی بچکۆلەی پاشاهاتوە ٠ زنەجۆڵا وتی خوشکێکم پێش خزمەتی ئەو کچە بچکۆلەیەیپاشایە درێژەی نەدەینێ کچەو کورە بەدزییەوە بەیەك گەیشتن بـەلام پادشا کچی نەدەدا بەکوڕە جۆڵا بیانووی پێگرت ناردی بۆ بلبلی خۆش ئاواز ٠

کورە دیسان بەتەنیا کەوتە ڕێ شەو لەکوێرە شیوێ نووستبوو ٠ گورگێ منداڵێکی بەدەمەوە بوو هاتە بەردەبی پیلارێکی تێگرت لەدەمی سەندەوە منداڵەکە وتی : من کوری شای جنۆکانم ئێـسـا باوکم دێت مزگێنی لێداوا بکە باتەسپی ڕەشت باتێ بۆئەم سەفەرە

بەکارت دێ • شای جنۆکان هات منداڵی بردەوە • مووی ئەسپی ڕەشی دایە کەهەڵی برووزاند پەیدا بوو • سواری بوو رووی کردە طەلیسمی مەرجانە کەجامی چل کلیلو بلبلی خۆش ئاوازی تیابوو • ئەسپی ڕەش دەرسی دادا وتی : ئەو ئێشك چییانە شێرو پڵنگو سەگو طەیرو طیورن • هەرچی لەبەردەمیانایە بیگۆرە • کەلە قاپی چووە ژوورەوە ڕوانی دوو شێر پڕ بەردەمیانە لەپوشو پەلاش • لەرێ دوو حەیوانی نێچیر کردبوو هەریەکە یەکێکی خستە بەردەم سەریان هەڵبری بەروویەکی خۆشەوە تیفکرین • گەیە ڕاستی سەگ کای لەبەر دەمابوو ، ئەسپ ئێسکی لەبەربوو گۆڕییەوە تاگەیشتە بەر قەفەسی بلبلی خۆش ئاواز • دەڵەدێوێکی لەبەردا ڕاکشا بوو • لە دووردوە وتی : من عاشقی جەماڵی تۆم • چ خوا هەڵدەگرێ تۆ بەم شیرینیەوە لەچاوی عاشقانیان شاردێتەوە وەرە بابچیە دەرێ ، عاشقان جەماڵت ببینن • دەڵەدێوی مەمنون کرد قەفەسی بلبلی هەڵگرت • چریکاندی مەرجانە خەبەری بوەوە بانگی کرد بیگرن ، نەدێو نەئەسپ ، نەشێر دەخلیان نەکرد • مەعلووم بوو هەر کەسێ بەگوێرەی حاڵی خۆی بالەتەلیسمیشدابێ هەر هەڵدەگەرێەوە • شعرێکی کوردی ئەڵێت •

کەوتوینە ناو تەلیسمی بەدی چل کلیلەوە
کەر گۆشتی وا لەبەر دەم سەگ کای دراوەتێ
کارت نەدەتە دەستی یەکێ کەئەهلی نەبێ

ڕێك ناكەوێ ئەگەرچی بەجادوبی سەهلی بێ

# هارون الرشید و نزهــة القلوب

هارون الرشید کەنیزەکێکی زۆر جوانی بووە ناوی نزهة القلوب بوو هارون ئەمەندەی خۆش ئەویست باوی لە ســـەیدە زوبیدە سەندبوو • زوبێدەش فرسەتی لێ‌دی کە هاروون لە بەغدا نەبوو هێنای کەنیزەکی گرت بێهۆش داررووی دابە لووتیاو صندوقێکی بۆ قیرتاو کردو خستیە ناو صندوقەکەوە دای بەدەم ئاوەوە • لەخوار بەغداوە ماسی گرێك تۆڕی هاوێشتبوە ناو ئاوەکەوە کە دەری‌هێنا وای زانی ئاڵتون‌و پارەیە ، گرتی بەشانی‌یەوە هێنایەوە بۆ ماڵی‌خۆی کەسەری هەڵبجری. تەماشای کرد ئافرەتێکی نازك‌و نازداری تیایە دەستی سارد بوەوە وتی : من تێستە چۆن ئەم ئافرەتە ئەلمۆذەیــ بەخێوکەم بەمن بەخێو ناکرێت و تووشی گۆبەندیشم ئــەکات • لەم گوفت‌وگۆیەدا بوو ئافرەت پژمی‌و هاتەوە ســەرخۆی • وتی ئامان لەرێی خوادا لەکوێم ؟ ماسی گریش بەگاڵتەوە وتی لەکوێ ئەبی وای لەکۆشك‌و سەرای خەلیفەدا ئافرەت ترساو وتی: تو خوا ئیتر مەمبە،ە لای سەیدە زوبیدە •

ماسی‌گرە وتی : نابەم • کەنیزەك وتی : برسیمە کابرای ماسی گر ماسی بۆ سوورکردەوە • کە نانی خواردوهۆشی بــەتەواوی هاتەوە بەخۆیا تەسکەرەیەکی پی‌یا نارد بۆلای پیاو ماقوڵی خۆی خەبەریان دابە خەلیفە دەست بەجێ هات بردی‌یەوە • پارەیــەکی

زۆری دا بە ماسی گرەکە کابراش پارەکەی کردە چاڵەوە شەو کەوتە خولیاوە ، کە ئەگەر خەلیفە پارەی پێ بوێ خەبەر بزانێ ئەم پارەی هەیە دێن داوای لێ دەکەن ، ئەمیش ئەڵێ : پارە شك نابەم ، ئەوانیش لێی ئەدەن ، ئەمیش بە ئێدان رانەهاتوە خۆشە نەبوە ، وا چاکە لەشی خۆی خۆشە بکات • خۆی رووت ئەکاتەوە لەو بەر سەرمایە قامچی لە خۆی ئەداو هاوار ئەکات : بەخوا پارە شك نابەم • دەرودراوسێ لێی گرد ئەبنەوە •• خۆزگە پارە دارەکانیش لەشی خۆیان خۆشە بکردایە •

## لە ئەفسانەی کونا

لە ئەفسانەی پێشینیاندا نووسراوە کاتێ ئەسکەندەری رۆمی سەودای جیهان گیری کەوتە کەللەوە ، چوە لای افلاطون کە کەمەر بەستەی بکاو شاگردێکی حەکیمی خۆی لە گەڵ بنێریت افلاطون بە شاگردە حەکیمەکانی خۆی گوت کێئارەزووی هەیە بچێلە گەڵ ئەسکەندەردا ؟ • جالینوس وتی : من دەچم افلاطونیش ئەوی نەنارد ، وتی : من ئەمەوێ ئەرەسطۆی لە گەڵدا بچێ • جالینوس لەمە توڕە بوو دوو باڵی مفەبای بە فەن دروست کرد و کەوتە کار شکەنی ئەسکەندەر ، هەر شارێ ئەسکەندەر رووی تی ئەکرد ئەو لە پێشەوە ئەچوو ، راوو۔ تەگیری بۆ ئەکرد • جارێکیان بە هێزی فەن لە هێزی باهوی پیاوان مارێکی دروست کرد هەرچی ئەیبینی هەموو رەگ و

ئەندامی لەشی دەهاتە خرۆش ، بە عصبیەتەوە ئەوەندە پێ دەکەنی تا شەقی دەبرد • نـاوی نـابوو ماری قەهقەهـە ، لـە رێبـازی ئۆردووی ئەسکەندەرا لە دەربەندێکا دای ناو ئەسکەندەری پێ‌مرد.
ارسطویش هات مقابل بەوە ئاوێنەی ئەسکەندەری دروست کـرد، بردیان روو بە رووی مارەکە دایان‌نا کەلە ئاوێنەکەدا شێوەی‌خۆی دی خۆیشی وەك ئەوانە شەقی برد •

خۆزگە ئەوانەی کە خۆیان لە ئاوێنەی دێودا ئەبینن جارێکیش خۆیان لە ئاوێنەی ئەسکەندەردا بدیایە •

## ئـەمە گامێشـە و ئـــەوە گومێشە

مەلا قانع تحصیلێکی باشی ئەبێ ، لە دوانزە علمەی کـۆن دوا پلەی منطق تەواو ئەکاو سەودای مەعانی و بەیان ئەیخاتـــە داوی بەد ناوی شاعیرانەوە • ئەمە بەرجا ، لووتیشی لـە حـیکـمەت و فەلسـەفە ئەخورا ، گاڵتەی بە گاکەی ژێر زەمین و گاکەی ئاسمان ئەکرد ، لەبەر ئەوە لە هیچ مزگەوتێکی شارستاندا داوی دا نامـە زرێ و روو ئەکاتە لادێ ،رۆژێکی تۆف باداوە پیچ‌خۆی ئەکوتێتە بادانە شەو تێ ئەفکرێ کورەی مزگەوت بە پێڵەواری وشـــــك داخراو منداڵ‌ومەزن لە دەوری کۆبوونەوە مەلا جاراللەی امامـی مزگەوت چاوی بە مەلا قانع کەوتبوو خەریك بوو لە نـــــــــاو خەڵکەکەدا خۆی هەڵکێشێ دەستی کـرد بە وعـظ خـوێندنەوەو وتی : شێخێ لە آروزەرد بوو شێخی مزگەوتەیان پێ دەگوت کـە

مرد ناشتیان من خۆم چاوم لێ بوو بردیان بۆ قەبرسانی گاورەکان و قەشەیەکیان هێنایە قەبرەکەی ئەوەوە . ئەمە لە بەر ئەوە بوو کە بە بەرەکانی لە گەڵ دەرەییانەدا ئەکرد . . . . ساڵێکی تر لەبەنوز بووم بەگە شەلە مردو بردیان بۆ گۆڕخانە لە ری بوو بە بەرازو دایە ئەو کەژە ئەویش هی ئەوە بوو مەلا بەزێنی ئەکـــرد زۆری خوێندبو مجادلەی لە گەڵ مەلایان دەکرد وای دەزانی بـــە زۆر خوێندن ئەبێ . ئێستا من فاتحام زۆر چاك رەوانە (سمایل نامـەو ناگەهان و بیاداودو باغەباز)م لە بەرە ئێتر ئەوەندەم نەخـــوێندوە عەقیدەم بگۆرێ . مەلا قانع لە داخانا ئاوسابوو دەنگی نەکـرد تـا نوێژی خەوتنان ، مەلا هەڵسا امامەتی کرد(دولولو کەنەو کەنس و سیراط)ی تێکەڵ کرد کە لێ بوونەوە قانع پێی گوت : مەلا تـۆ ئەتگوت : فاتیحەم رەوانە ئەم غەڵەتانە چی بوو ؟ . وتی : تـــو اعتراض لە فاتیحا دەکەی ؟ کافری . ئەگەر راست ئەکـەی وەرە امتحان بدەین دەمودەست هەڵسا چوو خەڵووزێکی باریك و تەبەقێ کاغەزی صالحی هێنا وتی : دەفەرموو گایەك بنووسە . قانعیش بە قەڵەمی فەرەنگی گاف ئەلف گایەکی وردی نووسی . مەلا لـــە دەستی وەرگرت بە خەڵوزەکـە سەرو گـوێ و کلك و شـــاخی گایەکی رەسم کرد و بانگی کرد ، خەڵکەوەرن سەیر کەن هەموو وتیان : اشهد باللە ئەمەی تۆ گامێشەو ئەوەی ئەم کابرا خۆیریـــە نووسیویە گوومێشە . ئینجا مەلا وتی : ئەمە کافرە بیخەنە ئــــەم

ئاگرەوە • بە هەزار گوبچر گوبچر میوانێکی خوێندەوار قانـــعی رزگار کـــــرد •

## ســەیر و ســەمەرە

لە ئەسکەندەر نامەی ئەفسانەیی‌دا لە بیرم ماوە ، ئەســکەندەری رۆمی گەیشتە شارێك ئەو شارە مەرگی تیا نەبوو کەسیش بـــە نەخۆشی نەدەمرد • هەرکەسێ ئاکامی مەرگی بهاتایە لە سـەری، گوێزەوە بە دەنگێکی بڵند بانگ ئەکرا : فلان کەســی کـــــوڕی فلان کەس وەرە • هەموو شارەکە گوێیان لێ دەبوو • ئیتر ئەو کەسە زنجیرو باڵە هەنگت بکردایەدەی پچراندونەدەوەستادەرۆی‌و تا لە سەری شاخ ئەچوو بەودیوا ئیتر کەس نەی ئەدیەوە • هاتە عەقڵمەوە ئەگەر دوو کەس ناوی خۆیان‌و باوکیان یەك بوایـــــە کامیان ئەچوون مثلا من ناوم توفیقە ، باوکم محمودە • لـە عەینی ئەم شارەدا یەکێکی تر ناوی توفیقە باوکی ناوی محمودە نــــەك تەنها ناوی خۆمان و باوکمان • من حاجیم ئەویش حاجی‌یە • باوکم ئاغایە باوکی ئاغایە • بەهیچ لێك ناکرێینەوە • ئیمە چی بکەین • جارێك دەعوەتیان بۆ من کردبوو تەسکەرەی دەعوەتەکەیان بـــۆ ئەو بردبووچوو خواردی • هەر ئەورۆژەوەصلی ضریبەی دوکانی ئوتێلیان هێنابووە سەرمن کەهی ئەوبوو ئەیان وت : تۆبیدە • ئەم وت : باوکم کێ‌پلاوی خواردووە ئەوە بچێتە پەردەوە • خێر هەر داوایان لەمن ئەکرد • دوێنێ ئەو دەعوەتی بۆیـــەکێ کردووە •

ئەمرۆ خەڵك گلەییان لەمن ئەکرد : بۆچی بانگت نەکردوین ؟
بەخوا ئەگەر بێتو لە گۆیژەوە بانگمان کەن ئەو ئەنیرم بەگوێ ترە
ئەتوانێ تائەوێ راکا ٠من ناتوانم لەجێی‌خۆم بجوڵیم ٠ ئیمەبەرجا
لەناو خۆمانا رێك ئەکەوین ٠ یا ئەگەر دوو شخصی تر بەبێ‌لەقەب
خۆیان‌و باوکیان یەك بێ ئەوەچی لێ‌بکەین ؟ ئەویش باشە تەنها لـە
لبنان بانگ نەکرێ‌ین ٠

سپڵەو بەدنمەك لەقە لەخێری خۆی ئـەدا

رەئیسی بلدیەی شام کورێکی‌جوانی نەوجوانی ئەبێ ناوی خاڵدارەو
لەلای باوك‌و دایکی نازدار ٠ پیاوێکی بەغدایان لائەبێ ئـەمەندە
مەدحی بەغدای بۆ ئەکا کوڕە کەڵکەڵەی بەغدای ئەکەوێتە سەر
باوکی رێگەی نادا ٠ دایکی خشڵ‌و لاگیرەی خۆی بۆدەگۆڕیتەوە
چەند بارێك کوتاڵی بۆ رێك ئەخات‌و ئەینێری بۆ بەغدا ٠ لەرێ
جەردە لەکاروان ئەداروتی ئەکەنەوەو خزمەتکارەکەیشی‌ئەکوژن
بەرووتی‌و قووتی‌و برسیەتی خۆی ئەگەیەنێتە بەغدا شەوئە چێتە
مزگەوتێ‌ئەنوێ ٠ لەنیوەشەودا سێ‌کەس‌بەچراوە دێنە زوورسەری
هەڵی دەستێنن ژنی پیاوێکی دەوڵەمەندی بەدخوو طەلاقی کەوتووە
ئەیەن مارە بەجاشی دەکەن ٠ ژنە زۆر جوان‌و پیاوە پیرو بەدخوو
بەد زوبان ٠ ژنە لەکورە مارە دەکەن‌و چاوی پێ ئەکەوێ ئەڵێ
طەلاقم مەدە مەترسە من بەخێوت ئەکەم کورە طەلاقی نـادات ٠
ژنە ئاڵتون‌و جەواهیری ئەفرۆشێ لە تەپەی کوردی خانویـــەکی

هەرزان دەگرن • هەردووکیان دەنگیان زۆر خۆش ئەبێ گۆرانی ئەڵێن و عود لێئەدەن • خۆش رائەبوێرن تا پارەکەیان ئـەبڕێتەوە کوڕەش ناتوانێ هیچ ئیش بکات دۆش دادەمێنن •

شەوێ لە ئاهەنگی خۆیانا ئەبن هارون الرشیدو جعفرو مسرور بەخۆ گۆرین بەشاردا ئەگەڕێن • هاروون گوێی لە دەنگی عودو گۆرانی ئەبێ • بێاختیار سەردەکا بەژووراو سڵاو ئەکاو دائەنیشێ ئەڵێ : ئێمە سێ دەروێشین هەر یەکە لەلای خواوە ئیشنـــــیکی داماوانمان پێسپێراوە ئێوە نەختێ درێژە بدەن بەئاهەنگـــــەکەتان ئێمەیش مرادتان بەجێ دێنین زنە بەسۆزی عەشق و کورە بەناڵەی غەریبیەوە وای ئەڵێن هارون زۆری پێخۆش ئـەبێ • لێیـــان ئەپرسێ چیتان ئەوێ ؟ کورە بەسەرگوزشتەی خۆی ئەگێڕێتەوە کە بە تجارەت هاتوەو رووت کراوەو زنەیش کەژنی فلان کەس بوەو جۆنیان لێداوەو کابراطەلاقی داوەو لەم کوڕە مارە بەجاش کراوەو ئێستا قاضی ئەیەوێ بەزۆر مارەی کاتەوە لـــــەمێردی پێشووی • هارون ئەڵێ ئێوە گۆرانی خۆتان بڵێن • ئێمە دوعاتان بۆ ئـەکەین خوا چارەتان بۆ بنێرێ •

بەیانی هارون ئەمر ئەکا قافڵەیەك لە قوماشی شام تەرتیب بدەن و کاغەزێ بەزبانی باوکی کورەوە بنوسن کە خەمەرم زانی رووت کراوی واسەرلەنوێ ئەوەندەی ترم بۆ ناردی • قاضیش ژنـــــە بانگ ئەکا ئەڵێ :مەترسە لەو کوڕەت ناسێنمەوە • کورەخانویەکی

گەورە ئەکرێو ژنەش جلوبەرگی جوان لەبەرئەکا • هارونیش ئەڵێ : بابچین بزانین لەچی‌یان ؟ کە ئەچن لەدەرگا ئەدەن جنێویان پێ‌ئەدەنو دەریان ئەکەن گۆرانی‌یان بۆ ناڵێن • هارون زۆربەست ئەبێو جەعفەر بەئیشارەت بەکوڕە ئەڵێت ئاگات لەخۆت بێ کەی باوکت خەبەری‌تۆی زانیو کەی واکوپر قافلەی‌تری‌بۆرێك خسی ئەمە هیمەتی دەرویشانە • دەرویش مەرەنجێنە خێر دەماری‌شامی لە کەللەیا دەبێ • نای‌بیەت • دەریان ئەکا•

خەلیفەیش بەجەعفەر ئەڵێ : ئەمە بەدنمەکە • بەیانی زووماڵ، کوتاڵو ئافرەتی لەگەڵ بارکەنو مەهێڵن لەبەغدادا بمێنن ئەمانەهیچ وەختێ بۆ ئێمە خێریان نەداوەتەوە • پیاو سپڵەو بەدنمەكوبەدخوو بێ‌وای لێ‌دێ لەقە لەخێری خۆی ئەدا

## ئەسکەندەر نی‌یە دیوە

خوداوەندی عالەم ئەسکەندەری زاڵ کردبوو بەهیچ سوسی نەدەهێنا پادشاهانو خواوەندانی ئەو زەمانە کەبە شەڕ دەرەقەتی نەئەهاتن بەسحر بەفریان بەسەرا ئەباراندن •بلبا عەیاریان دەنارد ئەسکەندەریان لەخەودابێ‌هۆش ئەکردو ئەیان دزی جارێکیان‌یەکێ لە خواوەندەکان کە مەرجانەی جادووی لەژێر فەرمانـــدا بوو ناردی بەسیحر ئەسکەندەریان دزی‌و جادوەکە خۆی خستە شکڵی ئەسکەندەرەوەو لەسەر تەخت دانیشت هەموو شـــازادەو پاڵەوانەکانی یەکە بەیەکە تۆراندو دەری کردن کەسی لـــە

ئۆردودا نەهێشت • رۆژێ ارسطو مهتر نەسیمی عیاری بـــانگ کرد وتی : باباتەمە ئەسکەندەر نی یە ، جارێ کەس نەی دیـــوە عیادەت بکا ، دوای ئەوە پاڵەوانی وەك محمد شێرزادو لەندەهوری دەرکردلام وایە ئەمە جادویەکەخۆی بردۆتەرەنگی ئەسکەندەرەوە باباوتی :چی‌بکەین ؟ارسطو وتی :جارێ ئەمەیە •هـەرچی‌علماو مشایەخێ هەیە لەبارەگـادا کۆنەوە ، زێـوەری ابراهیم بخـوێنن ئەگەر جادووبێ ئەوا رادەکا • کە کۆبوونەوە دەستیان کـرد بـە خوێندن • جـادوو رەنگی هـەڵبزرکا و چـوە شکڵی دێوێکـەوە ئەندوورە زەنان چوو بە ئاسمانا •

دەردی درێژی تۆیە لە ماڵتا تـــەڕ ئەبم

خوا لە گشت لایەکیان خۆش بێ • شـــێخ سەعیدو شـــێخ محمدی مفتی پەنجا ساڵ لەمەوپێش بۆ خـوازبێنی هاتنە هەڵەبجـە لە کۆشکە مەشهورەکەی محمود پاشادا لە گوێ دەریاچە کورسی یان دانابوو دانیشتبوون • دەمی نیوەرۆ دەستەی کوڕگەل ئـــەو کورســی‌یەی محمود پاشــاو مفتی‌و شێخ سعیدی لـەســەر بـوو نخونیان کردەوە هەرسێکیان کەوتنە حەوزەکەوە محمـود پاشـا، شێخ سعید کەڵەگەت بـوون سەریان بـە دەرەوەبوو ، بەڵام مفتـی وەختەبوو بخنکێ هێنایانە دەرەوە • محمود پاشـا فـەرمووی : ئـا مفتی کەڵەگەتی بۆ رۆژێکی وا باشە پیاو ناخنکێ • مفتی فەرمووی ئەمە دەردی درێژیی تۆیە لە ماڵی تۆدا من تەڕ دەبـم • محمـود

پاشا جوابی دابەوە : گردشی ئیوە نەبێ تا ئیستە ئەم حەوزە پیاوی گەورەی تێ نەخراوە ئەمانە هەموو نوکەن ٠

## داش بـــە داش

حاجی ئەوضای گۆجەی خـەیات زۆر مەشهورە بە گفتـەو سـە کردە پیاوێکی نایاب بوو ٠جارێك ئەیەوێ بچێ بۆ بەغدا ، رێ ترسی ئەبێ ئەوسەردەمە سەفەری قورعە ئەنێرن بۆ بەغدا ضبطیەو قەرە بالغ نایکاتە نامەردی دەستێ جی کۆنی ضبطیە لەبەر دەکاو شوێنیان دەکەوێ ٠

یەکەم قۆناغ ( تیمار ) ئەبێ دەگەنــە ئەوێ ، بـــەعادەتی کۆن خانەبگیر هەر کەسە روو دەکاتە ماڵێ ٠ ئەویش ئەچێتە خانەخوی یەك تەنها ئافرەتێك چەند مناڵێك ، پیاویان لە ماڵ نابێ ٠ ئـافرەت هەڵدەپێچی، قبولی بەمریشکم ئەوێ٠ئافرەت زۆر ئەپارێتەوەرازی نابێ مریشك ئەگرێو سەری برێو چەڵتووك دێنێ بـەدۆڵ بیکوتی ٠ بەحاجی ئەڵێ : فوویەك لەو ئاگرە بکە بایەکی لێ دەیێتەوە ٠ ئیتـر فزە ناکات ٠ ئافرەت مریشك بەرئەدا ٠ ئەڵێ ئیتـر رووی نایــــە داوای شت بکا ، ئەویش دادەنەوێ دەسکی دۆڵ هەڵگری ، دەردی حاجی لێ بەسەردێ ٠ ئینجا حاجی بانگ ئــــەکا : نڕ بـــەنڕ مریشکەکەم ئەوێت ٠

## ژن هێنان بە ڕۆژنامەو ئاسکۆڵ شــارەزوری

- ١ -

برادەرێکی ئیشکەری چاپخانەکەمان کە نــــاوی ( • • • )
أفندی‌یە کورێکە نەوجوانو خوێندەوار خەریکن ژنی بۆ بێنین •
دایكو خوشكو کەسو کاری نی‌یە تاشەڕی بوكو خەسووی‌لێ
پەیدا بێ • عارەق ناخواتەوە • قومار نــاکا ، جگەرە ناکێشێ •
خۆش صوحبەتە •

هەڕاج ، هەڕاج ، کێ شووی پێ ئەکا ، یا کێ کچی هەیـــە
بیداتێ بۆمان بنووسێ •

ڕۆژنامەی ژیان : ١٨/٤٧٥ ی نیسانی ١٩٣٦

- ٢ -

موحتەرەم خاوەنــــدی ژیــان

لە ژمارە ( ٤٧٥ ) دا بلاوتان کردبووەوە کە گوایا ( • • • )
ناوی برادەری مطبعەتان خۆی خڕ هەلداوە بۆ پەیدا کردنی ژنێك
جا لەبەر ئەوەی من بەتەواوی لە ئەوصافو ئەخلاقی ئــەو کوڕە
نەگەیشتم نەمتوانی خۆم سەربشك بکەم بۆ هاورێ‌یەتی ئەو کوڕە
تکا ئەکەم ئەمجارە لەلاپەرەی ژیاندا باسی ئــەمانـــەی خوارەوە
بەیان بفەرموون :

خەلکی کوێ‌یە ؟ کوردە ، عەرەبە ، تورکە ، فارسە چی‌یە •
چ زبانێك ئەزانێ • چ شتێك باش ئەزانێ • لەکوێ‌خوێندویەتی

بەرێژی ، پانو پۆری ، قورسی چەندە ؟
رووی ، چاوی ، لووتی ، دەمو دانی چۆنە
قژی لوولە • زەردە • رەشە • یان بۆرە ؟
عومری چەندە • ژنی تری هێناوە یان نا ؟
هیچ نەخۆشی هەیە یاننا • خێزانەکەیان هیچ نەخۆشی وارثی هەیە یان نا ؟ ئەگەر ئەتوانێ وێنەیەکی خۆی لە ژیانا بکێشێت •
ئینجا لە ژمارەی دوایدا منیش ئەوصـــافی خۆمنان پێش کەش ئـــــەکەم •

ئاسکۆڵ شـارەزووری

جوابی رۆژنامەی ژیان

ئەو کورە کەلەژیاندا بەیان کرابوو دامەزرا ، ئـەمما تۆ خاوەنی ئەم فکرە بەرزە بێ‌مشتەری زۆر باشت بۆ پەیدا ئەبێو بـەمەرامو مەبەستی خۆت ئەگەی •

ژیان : ٤٧٦/ ٢٥ ی نیسانی ١٩٣٦

- ٣ -

دیسان ئاسکۆڵ شـــارەزووری

لەژیاندا اعلانێ بۆ ( • • • )ئەفەندی نووسرابوو ۆ من زۆرم پێ‌خۆش بوو کەرەوشتێکی مەدەنی کەوتە شارەکەمانەوە،هەرـ ىو ( پیرەمێرد ) ی ژیان لەپێش ئیرانو سوریـــــەو حیجازدا حروفی لاتینی خستە ناوەوەو پشت ئەستووری دابە ژیانو ژنان •

منیش ئارەزووم کرد ئەم رەوشتی بەرۆژنامە شوو کردنە بگـرم‌و
بەراستیشمە یەکێکی هاورازو هاو مەغزو هاوگیان بدۆزمەوە ببین
بەهاوبەش ، هەڵکردو لانەیەکی بـەختیاری دابنێن‌و نـــــەوەی
خوێندەوارو بەکار بۆ وڵاتەکەمان پێ‌بگەیەنین •

ئنجا باجارێ تێتان بگەیەنم کەمن کێم‌و چیم‌و کێم ئەوێ ؟

من کچی پیاوێکم کەزۆر لە تورکیا بووە ، عومرم نۆزدە ساڵە
هەر چەند بەاتفاق ئەخلاق‌و علم لە جوانی لەپێشترە • من خۆم
جوانیم لەلا دەرەجەی سێیەمە • لەگەڵ ئەویشدا خەڵك بەجوانم
ئەزانێ ، لە أقونیمی‌و تەگبیری ماڵ‌و نەخش‌و نیگارو ماکینەدائەتوانم
بڵێم تحصیلم تەواوە • عاشقی فەن‌و صنایعی نفیسەو بدایعی طبیعتم
لەبەر ئەوە وەك مریشك نایەمە کوولانەوە • لە خۆێشم نائرسـم
چونکە وبۆم ساغ‌بۆتەوە کە زەوق‌و گیان‌و بەختیاری خێزان ئیمان
بەخۆشەویستی مێردو مێرد خۆش‌ویستنە • من کە مێردم‌بەرست
بێ‌گومان ئەویش منی خۆش ئەوێ ، لەهەموو دیمەن‌و سیمایەکدا
شێوەی مێردی خۆم ئەبینم ،دنیا لام پەشم ئەبێ ، لە رەفتاروکردارم
دا شوبهەو گومان نایێ ، بۆیە خواهیشی دەستی یەکێکی خوێندەوار
ئەکەم کەلەمن بگاو بەنووکە شەق کەرامەت‌و نەفسیەتم نەشکێنێ
ئەوسایە کەبێ‌قەدر بم خۆم بەصاحیب ناموس نـازانم ، بەڵام کە
قەدرم گیراو خۆم بەخاوەن شەرەف‌و ناموس زانی هەرگـــیز
ناموس شکێنیم پێ ناکرێت •

ئەمەوێ کە بەیانی‌یان لەپێش هاوسەری ژیانمدا هەڵسام‌و بــە دەستی خۆم شیرو چام بۆ دانا بەناوچەوانێکی رووناك‌و روویەکی خۆش‌و لێونێکی زەردەخەنەو شێوەو سیمایەکی مەردانەوە وابکـا کەچوو بۆسەر وەزیفەو ئیشی خۆی بەدڵ بیری بکەم وکاروبـاری ناومالْ، بەنەشئەی ئەو خۆشەویستی‌یەوە بینم ئێوارە کە هاتــەوە بەپێکەنینەوە چووم بەپیری‌یەوە ماندوێتی‌و رەنجی ئەو رۆژەی لــە دڵ دەرچێ‌و شان بەشانەوەو گیان بەگیانەوە روو بکەینە دەشــت‌و سارا • خۆئەگەر خوا بەچەیەکی پەیوەندی گیانمان بداتێ لەگەڵ ئەو بەندی جگەرەماندا لەکەناری‌ئاوێك تەماشای طەبیعەت‌وبەرهەمی ژیانی خۆمان بکەین •

ئنجا ئەو بەرهەمی ژیانە بەکشتەکێکی رووناکی‌و ئاوریشم دوو گیان بەیەکەوە ئەدروێ‌و بەختیاریەك ئەخاتە ناو ماڵەوە کەببێتــــە نموونەی ژیان‌و گوزەرانی نەتەوەیەك •

هەر نەتەوەیەك کە پیاو وژنیان خوێندەوار بێ‌و مەرجی ژیـانی کۆمەڵایەتی بزانن‌و منداڵیان بەهەستی میلی‌و نیشتمانی پەروەردەو گۆش بکەن هەڵبەتە ئەو نەتەوەیە هەمیشە لەپێش ئەبن •

ئەمە من سروشت‌و رەوشت‌و بیرکردنەوەم،لەسەر ئەمەیــە کە نووشی کەسێك بم کە بەختیاری خێزان بینم‌و نەوەیەکی بەنرخ بۆ نەتەوەکەم پێ‌بکەیەنم‌و بەیادگاری باش بۆیان بەجێ بهێنم •

ژیان : ٤٧٧ / ٢ ی مایس ١٩٣٦

تێبینی : بەپێی پێویست چەن وشەیەکی عەرەبی ئەم نووسینەمان کرد بەوشەی کوردی پەتی تا چێژی تەواوی لێ وەربگیرێت •

ـ بڵاوکەرەوە ـ

## پاشم بۆ قووت ئەچێت

جاران جوولەکەی ئەم شارە کە خەڵك بەجوولەکەیان ئەزانین و شەموان ئاگریان بەرئەدایە ریشیان لەتاوان هەریەکەیان خۆی کوتابووە بەنای شێخێك یا بەگزادەیەك یا ئاغایەك خزمەتیان ئەکردن • یەکێکیان بوو بوو بەپیاوی بەگزادەیەکی سەربە گیچەڵ کەپارەی نەبوو بەجوولەکەی گوت : هەندێ پارەم بۆ پەیدا کە وەختی خەلەو خەرمان ئەتدەمەوە ، وتی : بەگم نیمە بەلام صالحە خی‌خی هەیەتی بەسوود ئەیدا ئەچم لێی ئەستێنم مانگەو مانگ سوودەکەی خۆم ئەیدەم ، بەلام دنیامردن و ژینە بەڵکوو بەم زووانە ارەت نەبێ سەنەدێکم بۆ بنووسە •

ئەویش لەکاغەزی ئاو هەڵچنە دوو کەلیمەی بۆ نووسی ، جووە وتی : قوربان ئەم پارەیە زوو نادرێتەوە و ئەم کاغەزەیش تەنکە زوو ئەدرێ ، پارچەیەك مقەبای هێنا وتی : لەوەم بۆبنووسە • لە مقەبا سەنەدی بۆ نووسی و سا زۆری پێچوو ، کەمی ، پێچوو سایل پاشای قورت هاتە تیرەو هەرچی زۆردار هەیە حەبسی ئەکردن و دارو فەلاقەی دانابوو ، جووە بەهەلی زانی ، هاتە سەربەگ وتی : هەر ئێستا پارەکەم بەوێتەوە ، ئەی نەپراند خۆی

گیف ئەکرد ، سا هەر چۆنێ مۆڵەتی لێ‌حواست تاپانزە رۆژی تر پارەی بداتەوە • خوا راستان سمایل پاشا زۆری پێ‌نەچوو گەرایەوە رۆیی ، جووە لەترسا خۆی کوتایەوە لای بەگ‌و تەفرەی‌دا وتی قوربان خزمەکانی خۆت هەڵیان فریواندم و صالحە خی خی هەڵی پێچام • ئەویش وتی : قەیناکا ، چونکە من پارەکەم بۆ پەیدا کردووی بچۆ سەنەدەکەت بێنە پارەکەت بدمەوە • جووە سەنەدی هێنا نیو تەبەق مقەبا بوو • بەگ زۆری لێ کرد وتی ئەبێ ئەم سەنەدە بە ساغی قووت دەی ، لە بینی گیرا ، چاوی زەرد بوو وەختەبوو بخنکێ بە هەر رەنگێ بوو قووتی داو نەیشی ئەوێرا بروا ، تا جارێکی تر بەگ پارەی ئەویست دیسان لەوی سەند • ئنجا چووە لای حەڵواچی بە قەد بەری لەبێ حەڵوای وەك کاغەزی بۆ دروست کرد کە پێی ئەڵێن : کاغەزی حەڵوا • هێنای وتی : قوربان سەنەدەکەم لەمە بۆ بنووسە شیرینەو تەنك بانسم بۆ قووت ئەچێ •

## کوستە کوستە

مەلا عەلی سیارە بوو لە سیتەك بە مندالآنی ئەخوێند ، وەك لە حیکایەتێکی بە شیعردا نووسراوە ژنێکی کەتەی دمم هەراشی چل شووکەرەی ئەبێ ، پێی ئەڵێ : مەلا ! تۆ بە مانگی سێ پارە سێ پارەی قوتابی هەڵ ناکەی ، من بە مامانی چل قرانم کۆ کردۆتەوە بیبەرە شار بیدە بەکەرێك‌جاروبار دارو باری پێ بکێشە لەمە

چاکترە ، ھەڵدەستێ پارە ئەباو ئەچێتە مەیدانی کەر فرۆشەکان گوێ درێژێکی باش ئەکڕێ و ھەوسارەکەی ئەبەستێتەقوڵی رای ئەکێشێ سێ کەسی جوحتی ئەڵێن : با کوێتە کوێنەی لێ بکەین ئەم کەرەی لەدەست دەربێنین ، یەکێکیان ئەچێ بە خۆشی و چلۆنی ئەیگرێ ، دووەمیان ھەوساری کەرەکە ئەکا بە سەر خۆیەوەو بە پێی و دانی کەرە ئەڕوا بە رێوە ، سێیەمیان کەرەکە ئەدزێتەوە ئەیبا ، مەلایش جۆشی سەندوە حیکایەت بۆ کوێتە ئەکا دوایی ئەویش ئەڕوا تەنھا ئەوەی خۆی لێ کردبوو بە کەر ئەمێنێتەوە ، ئەویش پێ لە زەوی توونند ئەکا تا مەلا ئاوڕ ئەداتەوە ئەبینێ واکەرەکەی بوە بەپیاوێك ئەڵێ : کورە تۆ چیت ؟ ئەڵێ کەرەکەی تۆم ، ئەڵێ : چۆن کەر ئەبی بەزەلامو گفتوگۆ ئەکا ئەڵێ من لەپێشدا ئەم پیاوە بووم کەئەمبینی ، رۆژی سەرخۆش بووم لە دایکم داو دوعای لێ کردم بووم بەکەر ، ئەمڕۆ ئەلتیتا لەسەو کۆلانەدا منی دی بەزەیی پێھاتەوە دوعای بۆ کردم بوومەوە بە ئیسان ، ئنجا تۆ پارەت پێ داوم بارم پێ بکێشە چیم لێ ئەکەی یەکە مەلایش بەزەیی پیاھاتەوە وتی برۆ بەڵام جەوساریکەم بەجێ بەرێ ئەیبەم بەنیشانە بۆ ژنەکەم بالتیم نەدا ، ھەوساری بردەوەو سیتمالاو خەڵك و خوا پێی پێکەنین و بەنجا قرانیان بۆ کۆکردەوە چووەوە شار گوێ درێژێکی تر بکڕی ئێ فکری وا کەرەکەی لەمەڕ مخۆی ئەفرۆشن سەری نایە بناگوێی وتی : دیسان زەتە بورتە کەمت

خواردەوە بڕۆ هەر کەربە ناتکرمەوە . چوو لەولاوە کەرێکی تری کڕی‌و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە .

پاداشی درۆ با هەر درۆ بێ

یەکێ لە بەگزادەی ئەردەڵانی کەزۆر ئـارەزووی راوی بوو ، وە زیاتر لە راو مەیلی بەقەشمەری‌و گاڵتە بەعـــەوام کردن بوو لەسەری یێکەسە کۆشکێ دروست ئەکاو ژنێکی تیادێنێ کەهات بۆ راوی ئەو ناوە شەو لەوێ بمێنێتەوە‌و هەر لە تەنیشت کۆشـــکەوە کاروان سەرایەکی لێ ئەکاو ئەگەر رێبوار شەویان بەســەرا هات بێن تیا بحەوێنەوە ، رۆژێك لە راو دێتەوە ئێوارە وەختەیـــەکو دەرەنگ ئەروانی‌واقەلەندەرێکی بێ‌ریش‌و سمێل روو ئەکاتەکاروان سەرا ، ئەڵێ بۆم بانگ بکەن . شخصێکی عەجایبی عەتیکەی دێتــە پێش چاو . ئەڵێ : دەرویش ئەم ئێوارەیە لە خزمەتدا بین یێکـەرە نان بخۆین . قەلەندەر دادەنێ‌و خۆی دێتە دەرەوە . تــــەرتیبی هەوێنێکی قەشمەری ئەکاو رائەسپێری کە ئێوارە وابکەن . دێتەوە لای قەلەندەر ئەی‌دوێنێ تێ‌دەفکرێ دنیا گەڕیدەو تەجرەبـــــە دیدەیەکی تەواوە . ئێوارە سفرەیەکی جوان ئەرازێنێتەوە کەوچك‌و چنگاڵ‌و قاپ‌و خاولی‌و سفرەچی لەپێشدا کلسە فەخفوریەکی قوولی سەر داپۆشراو دێنێتە سەر سفرە دا، ئەنێ ، کەســـــەری هەمێ ئەبڕێ هیچی تیانی‌یە ، کەوچك ئەگرێ بەدەستەوە ئەڵێ دەرویش فەرموو ئەمە ( دوگون چورباس ) ی پێ‌ئەڵێن . . خۆی لەپێشەوە

گوایە کەوچکێکی لێ ئەخوا ، وەکوو شوربایەکی زۆر نایـــــابی خواردبێ • قەلەندەریش هیچ خۆی ناشڵەژێنێ بەدەستوری ئـەو ئەڵێ : ئۆف چەند خۆشە ئەمەم مەگەر لەماڵی شازادەی تیــــران خواردبێ • بەورەنگە هەشت‌نۆقاپ دێنن هەریەکە بەناوێك قەزانمە بۆرك ، سەبزە فرنی لەودەمەدا بەگ بانگ ئەکا شامپانیاو ویسکی بێنن ، سوراحی جوانو قەدەحی زەرکفت دێنن ئەوانیش هیچیان تیانی‌یە ، بەگ قەدەحێ تێ‌ئەکاو ئەڵێ : چەرێو بەشەرەفی میوانی خۆشەویست • ئەویش قەدەحێ تی‌دەکاو ئەڵی : بەشـەرەفی مس فس باڵەوان • گوایە تەواو سەرخۆش ئەبێ ئەنەرێنێو راســـت ئەبێتەوە تا خوا هێزی داوەتێ زللەیەك ئەکێشی‌بەبنا گوێی بـــەگا عاقڵی ئەکا ئەڵێ شەرابی قەشمەری‌و بەدمەستی سەرســــەری • • ئیتر بەگ ئەمر ئەکا نانێکی زۆر بــــــە تەرتیب دێنی‌و حەلانی قەلەندەریش ئەکا •

## خو ملەر نیم وە دەنووك شـــەر بکەم

عەولی فەقێ قادری گورگەدەری جارێکیان بەپیادەیی کلغـەزمان پیا ناردبوە سنە لەوسەرەوە کە دێتەوە هەر لای قشلاخیەکان‌تووشی سوارەیەکی قشون دێ وا گرِی ئافرەتێکی داوە خەریکە بـەزۆر ئەیبا ئەمیش تەنیا کووتەکێکی بەدەستەوەبە پەلاماری سـوار ئەدا جڵەوی ئەگرێو دای ئەبەزێنێ خۆی سواری ئەسپ ئـــــەبی‌و تفەنگەکەیشی لی‌سەندبوو • زنە قشلاخیەکە ئەڵێ بەم‌مەردایـەتی

یەوە ئەسرپست زۆر لەمن بکەی • ئەویش ئەڵی : کەنێ من سـوار
بووم پام لەو ئاوزەنگیا ـدەستێکم بەجڵـەوەوە بوو دەستێکم وە
تفەنگەوە ـخۆمار نیم وەدەنووك شەڕ بکەم • سائەرە ئـەو ئازاس
داوەزێ وەزۆران بازی بزانین کاممان ئازاین •

## دەرمانی چاویەشەو شلەحەی حەی

هارون الرشید زۆر جار بەرگی ئەگۆریو وای لەخۆی ئەکرد
نەیناسنەوە ئەگەڕا ، تابزانێ گوزارشانی شار چۆنەو چی‌یە ؟ زۆر
ر جەعفەری لەگەڵ‌خۆی ئەبرد ، رۆژێ روو ئەکەنە ئەولای شار
وائەبینن عەرەبێکی دەشتەکی زرتە بۆز لابەلا سواری دێلەکەرێ
بووە چلوی دابەستووە بەعەتابەو مەووال وتن روو ئەکاتە شـار
هارون بەجەعفەر ئەڵی بیدوێنە • ئەویش ئەڵی : جنێومان پێ‌ئەدا
ئەڵی ئاخر منیش بۆیەك ئەڵێم جنێو بدا • جەعفەر ئەچێتە سـەر
رێی دەستی لە ملی کەرەکەی ئـەکاو ماندوو نەبوونی‌یـەکی
گەرمی لێ ئەکا • کابرا بەتوورەیی‌یەوە ئەڵی : تۆ دەسـت
ئەکەیە ملی براکەت لەگەڵ ئەو بدوێ دەخڵت بەسەر منەوەچی‌یە
ئەگەر دایکت ناردووتی من هیچ لەبیرم نەماوە کەی دایکم دیو.
خۆ ئەگەر لەوانەی بۆ مشتەری ئەگەڕێیتو لەناو شـاردا
مشتەریت دەست نەکەوتوە ، عەرەبی دەشتەکی‌و ئەو پیشە حیزە
جەعفەر ئەڵی : نەدایکم ناردوومی‌و نەلـە ئەدووی مشـتەری
ئەگەڕێم ـەزەییم پیانا هاتەوە چاوت دەیەشا ، منیش کەمێ دەسـی

حەکیمیم هەیە دەرمانێکت بۆ ئەڵێم بیکەیتە چاوت زوو چاک ئەبێتەوە کابرا وتی : دەرمانەکەت چی‌یە ؟ جەعفەر بۆی هەڵـــدا : رۆنی هەتاو ، دەنگی دەهۆڵ ، رەنگی ئاو ، تیشکی ئەستێرە ، خشـــەی گاگیرە ، سێبەری منارە ، وەفای خەڵکی ئەم شارە ، چاوی مـــار پێی موور ، دەوڵەمەندی‌ی مەئموور ، ئاشتی‌ی مـــیرات گر ، یەکبەنی‌ی دوو برای تێرە ، ئەمانە شەش مانگ لەبەر سـایەقەی هەساو دانێ ، شەش مانگ لە دەسکاوانێکی بێ‌بندا بیکوتـــــە ، شەش مانگ بیخەرە بەر رەشەبا ، ئنجا بیکەرە کلتووری بن کلکی ئەو دێڵەکەرەوە بەکلچێوکی بەرەقی تێرەکەر بیهێنە بـــــەچاوی سەرو خوارتا ، چاک ئەبێتەوە . یابە نەختێ خۆی بۆ جوولانـد یەکێکی کەرەنایی بو کێشا ، وتی ئەمە جارێ پێشـــەکی ( حق القدم ) کەچاکیش بوومەوە کۆنە کارەکەریکی قولەرەشی سەنکم ماوە ئەتدەمێ ، ئەوەندە زلە بەخۆت‌و ئەو هلوری‌یەی کە پێمـان پێ‌دەکەنی‌و وەکوو پێی خۆش بێ کەتۆ بەجێو بگەیەنێ بەیانی لە ئاشخانەکەی دوایەوە قاوەڵتی شلە حەی حەی بکەن بۆ تێوارە نان خواردن ئەگەنە میوانخانەکەی پێشەوە .

## قورتی نـەگبـەتی

سالحە خێ‌خێ پارەی بەسوود ئەدا بەخەڵکی ، زۆر تـەماعکارو منجەمنج کەربوو لە گەرەکی سەرشەقام دائەنیشت ، رەشـــــیدی حەمە صالح بەگە دزە هەندێ پارەی لێ‌سەندبوو ، نەیبوو بیداتەوە

هەموو رۆژێ ئەهاتە سەری ، رۆژێکیان زۆری تـــەنگەتاو کرد بەڵێنی دایە بەیانی هەرچۆنێ بێ پارەی بۆ پەیدا بکا ، خۆ لـەهیچ لایەکیشەوە دەستی نەدەکەوت ، هێشتا بۆی نەکرابوو لــــەماڵ دەرچێ صالحە خێ خێ بەردەرگای پێ گرت ، ئەویش لـــەتاوان پەیژەی داناو سەربان کەوت ، خاوەن قەرزیش چاوی لێبوودەرکی کردەوەو بەپەیژەدا سەرکەوت ، بانەوبان راوی نا ، رەشید خۆی فڕێدایە حەوشی ماڵی خلە بن جووەوە ، تومەز خلە نــەخۆش بوو لە حەوشە راکشابوو لیفەی بەسەرا هەڵکێشا بوو دیار نـــەبوو ، رەشید وای زانیبو نوێنە هەڵچنراوە ، بازی دابووە سەری ، خلە هەناسەی بەبەردا نەهاتەوە ، مرد ژنە تەڕ پیرەکەی خلە بەهاوارو هەرا دوای کەوت ، ئەویش لە دەرگای حەوشـــەوە بۆی دەرچوو خێ خێش بەدوایانەوە ، گەیینە کۆلانە تەنگەبەرەکەی بـــەر ماڵی حەمەی حەڵوا ، ژنە ئابلاخیەك مەشکە دۆیەکی دانابوو بیدا بـــە مالان بەلام سەر رێگاکەی گرتبوو رەشید قەڵەمبازی دا پێی لــــە مەشکە دۆ گیرا ، مەشکەی شەق کردو بۆی دەرچوو ، ژنـــــــە ئابلاخی لەوان شێت گیر تر ، هالیرەو هالەوێ بەشوێنیەوە ئـــەی قریشکاند ، گەیشتە بەر حەمامی سورەت بەهێ شێت لــــەوێ تەبەقێ حەڵوای پێبوو ئەیفرۆشت کەزانی وا کابرا رائەکا شێتانە هات رێی لێ بگرێ شانێکی لێدا ،

# له قەرەداغەوە بە ناوی « میشو » وە ( گوران ) ناردویـــە

شاری سلیمانی خرۆشاوە کەوتوونەتە مەراقەوە ( پیرەمێـرد )
میزاجی تێك چووە خواردنەکەی جارانی نەماوە . خزمێکی نزیکی
ئەڵی : بەیانی بەشیرو چاوە کاسەیە ماستی بـــــەچوار کولێرەوە
خوارد بوو هاتە ئیدارە خانە سید حسین حوزنی کەمۆڵەیە تەشریب
وە سینی‌یەك فرنی دەرخواردا ، لەدوای ئەوە کەبابی لەگەڵ‌شیخ
مجید خوارد ، تری‌و شوتی‌و کاڵەك‌و هەڵووژە چی‌یە ؟

گەورەو بچووکی شار هەر کەسە بەپێی تواستی خۆی هەرلـە
دانوولەوە تا قەرەخەرمان شتێکی قەرار داوە کە کەوتـە خواردنی
ئەواو بۆی بنێرن ، منیش بەم لات‌و لووتی خۆمەوە نەزرم‌کردووە
گایەك لە مدیر بدزم بۆی سەربڕم بەتەنیا نۆشی گیانی کا .

( مێشـــــۆ )

مشەی مێشۆمان لا گیزەی مێشە
لەساو ژیاندا خواردن لە پێشە
ئەگەر ضیافەتی رەئیســـتان ئـــەدی
ئـەکەوتە ئەحا وەك نەدی و بدی

( پـــیرەمێرد )

م . نوری کۆنە شاعیر یەك دوو ساڵە چیکلدانـــەی شیعری ون
بووە ، بەبەرۆش بەشوێنیا ئەگەرێ ، خەبەری دائیرەی شـــرطەی

داوە گەڕاون نەلەلای زاڵم نەلەلای مەزلوم نەیان دیوەتـەوە لـــە دۆڵابی حساباتا لەگەڵ ( لە خەوما ) ی جەمیل صائب بەیەکەوە نە خـــەوا بوون •

( مینـــــۆ )

شەهیدی خنجری عشقیمو برنمی خیزیم
مگر مسیح بگوید : کە قم باذن الله
زیوەر ئیستاکە پەرەسێلکەیە
تەنها گۆرانمان لەسەر هێلکەیە

بۆ قەشقۆلی چوو مصطفی صائب
ئەڵێی فەقیەو ئەچێ بۆ راتب

زیان : ١٥/٤١١ ی ئەیلولی ١٩٣٤ پیرەمێرد

## شـــیرازەی زەللەی مصطفی افنـــدی

+ سواری تانجیەکە بووم ، ماینەکەم شوێن کەوت
+ درەنگە ئەچین بۆراوەقاوەیە بەدەن بە تانجیوشێخم بۆرست کەن
+ یا مانگا ئەمر کەن شێخێکم بەنێ
+ سواری ماین خنوبی بوو بووم هەر چەند کلکم لێئەدا ئـــەو زەنگی ئەکرد بە چەتر لە سورداش گـەرامەوە ســـواری ( ••• بەك ) ئەبم ئەچمەلای اوتومۆبیل
+ ئافرەت تۆ بۆچ ئەوەندە شیرە شێر ئەکەی ، برۆ بەرۆکمان بەردە ئەگینە هەڵسم سەد ( •••) لە شەقت هەڵئەدەم .

+ مشکمان ئەخوارد چێشتی پشیلەیەکی بەسەردا هێنایین لێمـــان حەرام بوو

+ ( دوعای پاش نوێژی بە دەنگێکی بەرز ) : خوایـە پێغەمبەرم زۆرە گوناهم بکەی بە شەفیع •

+ باوکی لە سەگا وەك قەبر ئـەوەڕی •

مصطفی افندی وەك زەللەی زبانی هەیە ، زەللـــەی کردەوەی زۆرترە ، شەوێ لەگەڵ حاجی محمد ئاغای خاڵیا لە دێیەك میوان ئەبێ جێ نابێ ، لە گەڵ خاڵی ئەنوێ ، شەوێ دەست ئەکاتە ملـــی خاڵی بەرە بەرە لێی زیاد ئەکا ، خاڵی خەبەری ئەکاتەوە • ئەڵێ مجە لەعنەتی ئەوە چی ئەکەی ؟ ئەڵێ : ئای خاڵە چۆن ئەوە تۆی بەخوا وام زانی ژنەکەمی •

## راستی یەکانی مام چەوەندەر

جارێ پیاوێکم راونا لەبێستانێکدا ، لیم گوم بوو ،دوایی گەڕایین کونی کردبووە ترۆزیەك خۆی لەناو ترۆزیەکەدا شاردبووەوە •

لە شەڕی سەلمانی پاکا پێنج فیشەکم پێ مابوو ، شـەش دوژمنـــم پێ کوشت فیشەکێکم بۆاحتیاط هەڵگرت • تەیارەیەرووی تێ کردین چاك بوو ئەو فیشەکەم پی مابوو تەیارەکەم پیهێنایە خوارەوە •

## با بمرم لە غەریبیدا

ژن و مێردێك لەژێر جێگادا شەریان ئەبێ ، ژنـــەکە پیاوەکە دەرئەکا پیاوە لەودیو بێشکەکەوە هەڵ دەناڕێ ، کچێکیان دەبێ

دەڵی : بابە بجۆرە ژێر لێفەکە سەرمات دەبێ • بـاوکەش دەڵێ توخوا رۆڵە لێم گەری بابمرم لە غەریبیدا

## سەری من و کلاوی زور

ئێستا دەمنوسی سدارەم دانا وتم : سەرەکە وەرە بزانم چەنـــد کلاوت گۆریوە •

١ ـ لە زەمانی فۆتەدا هاتوومەتە دنیا ، بەڵام فۆچکەم بۆشیوە

٢ ـ فۆتە بورە بە تەپلەو جامانە ، تەپلەی هەورامان بە شەدەوشیلان

٣ ـ کلاو حوشتر کەبۆ ژانەسەر باش بوو •

٤ ـ عەرەقچینی قەرەداخ کە کچە جوولەکە دەیان چنی •

٥ ـ فێست و پسکۆل کەشیدەیان لەسەر دەبەست •

٦ ـ قەڵپاخ ٧ ـ فێستی بێ گوڵنکە ٨ ـ سدارە ماوەتەوە ئەمجارە •

## نمای هـــەورامی

سێ هەورامی ەمزگەوتێکدا رانەبوورن ، وەختی جەماعەت ئەبێ ئەو زەمانەیش جەمعیەتی هیدایەت مەربەی نوێژی نەکردایـــە جەزایان لێ ئەسەند لەترسا ئەچن بۆ جەماعەت • یەکێکیان ئەڵێ خۆ من نازانم نوێژ چۆن ئەکرێ؟ ئەویان ئەڵی: هەرچی مەلا کەرۆ ماش کەرۆ ئەچنە ریزو مەلا ئەچێتە رکوع ، یەکێکیان لـە گەڵی ناچێتە رکوع ، ئەویتر بانگ ئەکا چەفتالی چەفتەوە مـــەلا ـمیا • یەکێکی تریان ئەڵێت : یانەت بڕمی نماکەت بڕیا • سێیەم ئەڵێ هەر خۆم خاس کردم دەنگ لێ نەکردم •

## قسەی ئەمو ئەو

حەمە ئاغای عەتار ئەڵێ :

دوکانەکەم لەســـەر ڕێیە

هەرچی دەڕوا چاوم لێیــە

ئەحمەد ئاغای ڕەفیقیشمان ئەڵێ :

من ئاشەوانی قەزاو قەدەرم

لە هەموو ئاردێ تۆز ، وەردەگرم

مام قادریش ئەڵێ :

پیرێکی ژیرم . . . وا گۆشە گیرم

ئەوی تریشیان ئەڵێت :

جارێ وا شاسەری کەوتووە بۆم

نانی سمێڵ و ڕمی خۆم ئەخۆم

کەوتوونە دەوری بگرەو بەردەوە

یونسمان کەوتە دەریای دەردەوە

( گۆران ) کە شیعری کەوتە ناو ژیان

تۆلەی تاڵی بوو بەسەی و سێنان

عەزیزیش ڕۆیی بۆ قەرەچەتان

تۆ ( بێکەس ) دەڵێن : یاڵڵاهو ڕمان

### وەسمان پاشای ســـەر تیڵی جاف

وەسمان پاشا ئەبوایە هەموو ڕۆژی ملتی ببوایە ، ماستیش ،

بامۆکەوە ئەماڵی میرزا ئەولاّی پیاویەوە سلێمانی شانەبۆی دەهێنا
سلێمانیش زۆر ئارەزووی ماستی ئەبێ • چونکو سەرتوێژەکەنانی
بشکێ نەی دەتوانی لێی بخوا ، رۆژێ نەرێ قامیشی قەڵەمئەبینی
لوولەی قامیشی ئەبری بەئەسپایی گۆشەیەکی توێژاڵی ماستەکە لا
ئەداو قەڵەمەکە ئەکەیەنێتە بنی جامە ماستەکە توند ئەبێ نانەبێ
تا بەینی وادەکا دوایی ماست شل دەبی توێژەکەی دەنەوێ ، پاشا
ئەڵی : سلێمان ئەم ماستە لێی خوراوە • ئەڵی پاشا سەیری سەر
توێژی کە نەشکاوە • پاشا دەڵی : سلێمان ئەم قەڵەم تێبگەیەنە کە
ماست ئەخۆی سەرتوێژی ناشکێنی بەسەری طاهر کەوایەکت بۆ
ئەکەم • سلێمانیش لوولە قامیشەکە لەبەر پشتێنی دەردێنی لەژێر
توێژاڵی ماستەکەوە ئەیگەیەنێتە بن جامەکەو ئەڵی پاشا فەرموو
پاشا سەری سور ئەمێنی • ئەڵی کەواکەت بکەرە بەرو برۆ
مەیەرەوە بەماڵی منا تازەی کەڵکی تێرەت پێوە نەماوە •

## کفر ئەحمەد

کفر ئەحمەد گوی درێژێك‌و گایەکی دەبی ، گاکەی قەڵەو ،
بەشانو باهوو تووندو تۆڵ ، قۆج وەشێن‌و دراوسێ لێ بێزاربوو
گۆشتیشی چەورو ئاودار بوو ، ئالیکی زستانی بەشی تەنها لاّخێ
بوو ، دەیویست گاکە سەربری‌و گۆشتی‌و چەرمی بفروشێ
کەرەکە بۆ دارکێشان بمێنی لەترسی ژنەکەی نەیدەوێرا تا
چاری نەما هاواری کردە خوا تووشی دەردی بێ سەری برن

سەوێ تەویلە رووخا کەرەبەسزمانەکەی لەژێرا تۆپی • گا بە زرتو زیندوویی مایەوە • لەو هەلەدا کوێری بەبەر دەرگادا رابورد هێنای وتی : دەستیان لێدە بزانە گاکامەو گوی درێژ کامە ؟ کوێر ناسینی سەری هەلبری بۆ ئاسمان وتی : کوێر ناسینی بەلام تۆ • • •

## گشت چشتی وە نییەتە

کابرایەکی لا دێیی هاتبوە شار چوبووە حەوزی تیکەوتنی مزگەوتێکەوەو بەتێکی رەشی گرێ زۆر لێدراوی لەکەناری ئاوەکەدا بوو • هەر جارێك خۆی لەئاوەکە هەلدەکێشاو دەهاتە دەرێ گرێیەکی لەبەنەکە ئەکردەوە هاورێیەکی بە دیاریەوە وەستابوو لێی پرسی ئەرێ برا ئەوەچی ئەکەی ؟ وتی براله هەر جارێ لیم بقەومێو غوسلم بکەوێتە سەر گرێیەکم لەم بەنە داوەو قەرزە لەسەرم وا ئەیدەمەوە • هاورێکەی وتی براله ! بەردت لێ‌واری ، خومن بۆ سالێك پێشەکی جاری وسل دەکەم نیەتی سالێکی لێدێنم • گشت چشتی وەنیەتە •

لە پێشا تارەت ئەگرێ

سمایل ئاغای یوزباشی رەدیف بوو لەشاربازێر ، مەسینەیەکی بوو کە ئەچوە سەرئاو تارەتی پێدەگرت ، مەسینە شکابوو ئاوی رانەدەگرت پریشی دەکرد لەگەل خۆی دەیبرد ، پرسیان : مەسینەکەت شکاوە چۆن تارەتی پی دەگری وتی تەگبیرێکی باشم

یێ کردووە ، هەموو جارێ تامن لێدەبوومەوە ئەو ئاوی تیانەدەما
ئێستا نایەڵم ئاوی تەواو بێ ، لەپێشدا تـــــارەت دەگرم ، دوایی
ســەراو دەکەم

## ها ئــەوە خۆتو دەســت نوێژەکەت

پیاو ەاقوڵێك ئەچێتە مزگەوتێکی کەرکوك دەست نوێژ بشـوا
مجەور لولیەی بۆ پڕ ئەکاو بۆی دێنی و ئەیکا بەدەســــتیا تالێ
ئەبێتەوە ، دوایی داوای بەخشیشی لیدەکا ئــەویش دەڵی : بۆچ
ئاو بەپارەیە ؟ ئەی خزمەت خۆراییە . کابراش قینی هەڵدەستیو
لنگ هەڵ ئەبڕێو یەکێك لێئەدا . ئەڵی هائەوە خۆتو دەســت
نوێژەکەت .

## نــە گارەگارو نــە هێلکەت

کابرایەك باڕۆکەیەك بەخێو ئەکا تادێتە هێلکە سێ ڕۆژئەگارێنێ
دوایی هێلکەیەکی بچوکی بۆ دەکاو کەلەسەر هێلکە هەڵدەسێ
ئەوەندەی تر دەقیرێنی کە دەبینی هێلکەکەیشی بچوکە ، هێلکەش
ئەشکێنیو خۆیشی سەردەبڕی . ئەڵی : نە گارەگارو نەهێلکەت .

ڕێوی کەروێشکی بە زەویدا دا
پێی قیت بووەوە و سمێڵی بادا
کەرویشك پێی گوت : هێندە ئازا نیت
حیزی من بوە بە باڵەوانیت

خۆزگە ئـــەمزانی بۆچ

ماوەتی کەڵەشێر سەرنابرن • پر دێی هێلکە نافرۆشـــــــن
هاواری کەرویشك ناخۆن • هەندێ گەورە ماڵ جەژنان ئــــاگر
ناکەنەوە • خێڵی هەمزەی مەسرەفی بابیرم شەموان ســـەرو جل
ناشۆن • گەرەکی خوار شار ( جوولەکانی جاران ) بەشـــەموان
دەست لە ئاگر نادەن • گۆشت نەخۆرو کشمیش نەخۆر کێن ؟
هازو لووشەو بزنە ریشە بۆچی دەشبێن • پشتەماڵی حەمام کێن
سوورە داڵە بۆچ ملۆزمی خاڵە • چۆن جوعمە لە شەمەدا ئـەبێ
گیبە بەچییەوە خۆشە • کوونەماسیو جرت ئاوا چییان لێهات

## دیسان مصطفی افندی زەللە

مایینەکەم داوە بە مەولەوی پیاوم بەنیوەبەر ، ئەگەر مەولـەوی
بێ بۆ جوانو ئەسپ ئەگەر جوانو ماین بێ بۆ خۆم •

جار جاریش کەئیشی زۆر دەبوو دەیوت : دوو خوام بۆتوێژ
پێناکرێ • لێم پرسی چۆنی ؟ وتی لە دیوەخانی مدیرم هەمیشە
کلکم بەدەستی جزوەی قاوەکەوەیە •

ئەوی من بە کابرام کــرد بت خســتایە سـەر سـەگ نان بــۆنـی
پێوە نەدەکرد • کوا کوبەکان کە چەتاڵەکانمان پێ خوارد •

پیاوی پیری دوو ژنەو ژنی جوان

پیاوێکی ریشماشو برنجژنێکی منال کار بەسەر ژنەکۆنەکەی
دێنێ • هەر شەوێ لای ژنە تازەکەی ئەنوێ ئارایشی ئەداو هەر

موویەکی سپی لە ریشیا ئەبێ بەمووکێش دەری دێنێ تــا جوانز ریش رەش بێ‌و عاری لێ‌بێ بچێتە لای ژنە کۆنەکەی هـــــەر ئەویکیش لای‌ژنە کۆنەکەی‌دەنوێ ئەویش مووی رەشی لە ریشا ناهێڵێ،بەڵکوو ژنەجاهیلەکەی پێ‌رەزا نەبێ رۆژی دەست بەریشیا دێنێ ئەبینێ هیچ ریش‌و سمێڵی نەماوە خۆی بـەخۆی ئــەڵێ پیاو پیر بێ‌و ژنی جوان بێنێ ئەبێ ریشی بنێتە دەستی ، کەریشیش نرایە دەست ژن نەریش ئەمێنێ‌و نەسمێڵ .

پیاوی دوو ژنە ناوی جوار چاوە
لای هیچ ژنێکی باوی نـــەماوە
بە دوو ژن هەردوو دەستی گیراوە
وای لە قونێ‌یەو وای لە دۆشاوە

## تری بەزور عەیب نی‌یە

جارێك ئەچوین بۆ ناو بژی هەمەوەندو شوان ، شەوی لــــە چەمچەماڵ بووین ، شێخ مارفی نەقیب شەو حکایەتیان بۆ نەکردایە خەوی نەدەهات . حیکـایەت خـوانی خۆی لـەگـەڵ نەبـــوو ، جووڵەکەیەکیان هێنا حیکایەت بکات وتی : حیکایەت نازانم . وتیان سوێند بخۆ ، وتی : بە مووساو محمد نازانم . وتیان : ســــوێندی وامان ناوی . نالە دزێژی‌یان چـوارپەل بەست . وتیان : ئەگـەر راست گۆی بەزێر سـکی نالەدا تێ‌پەڕە ، تومەز ئەمە تەڵــەو رێوی بوو ، بە تەڵەوە بوو ، یەك دووبای لێ بەربووەوە و خۆشـی بەز

بوو ، وەك با بۆی دەرچوو ، بەبانی سەرم كێشایە حوجرەكەی وتم شەلە مەلەخی شەوشەو • وتی : ئەی قوڕ بەسەر عەقڵت وەدەدانی ترێی بە زۆر عەیبە •

هەر ئەو سەفەرە بوو گەشتینە ماڵی رەشك ، مەجلیسێكی زۆر گەورە : شێخ سعید ، شێخ مصطفا ، شێخ مارف ، محمود پاشا ، وەسمان پاشا ، ئەحمەد پاشا ـ ئای وڵات ئەو پیاوانەت كوێ حوون ! ـ هێشتا دەست بە گفتو گۆ نەكرابوو مەلایەكی موحتەرەم هاتە پێشرەوی بفەرموێ وتی : پێغەمبەر فەرمویە ( الدنیا جیفة وطالبیها كلاب ) سا مەلانەمەی لەدەم دەرهات ، پاشایەكمان مراندی وبینەقاقای پاشایەكی تری گرت ئەوەی مراندی تەواو پیاو بوو وەك شێر وابوو ، مرەكەیشی نەعرەتەیەكی شێرانە بوو ئەوی تر بێ دەست و پل بوو وتی : ئای باوە ! جیی نەكەی وتی : كە تیمە سەگ بین با من تۆ بخنكێنم • كەس نەما لە بەر پێكەنین مەلا چاری نەما هەڵساو مەسلەحەتیش بە پێكەنین كرا •

## نوێژی بێ دەست نوێژ

مەلایەك بۆ رەمەزان نوێژ بۆ دێیەك ئەكا ، دوایی سەرفترەی نادەنێ ، ئەڵێن : تۆ نوێژت بۆ خوا كردوە • مەلایش ناچار لە داخا ئەڵێ منیش با پێتان بڵێم ئەوەتی نوێژتان بۆ دەكەم بەبێ دەست نوێژ بوە •

## کلیل لەباخەڵمایە خەو لە خۆم تێك نادەم

ئەوللاغای تەمر ئاغا وەردیەوان بوو (مأموری سجن )بە شەو لە بەر دەرکی بەندیخانەکەدا ئۆدەیەکی بوو لەوێ دەنوست ، دەرکی دادەخست‌و کلیل ئەنایەباخەڵی‌و لێ‌ی‌دەنوست، شەوێك بەندی‌یەکان دیواری پشتەوەیان بڕی‌بووهەموو رایان کردبووخەبەریان‌کردبووەوە وتبویان : هەستە بەندیخانە چۆڵ بووە • ئەویش ئەڵێ : ( أنختار قوینمدە درأویقومە بلقارم ) واتە : کلیل لە باخەڵمایە خەو لە خۆم تێك نادەم •

## چرا بەدەست ئەیێ پێشکەوێ

لالۆ أحلیکمان بوو تازە لە قرالیەوە هاتبو خزمەتکار بوو • شەوێکی لێزمەی وەك ئەمشەو نەقیب بە ئارەزوو دەرەنگێ هاتە ماڵی ئێمە ، مەلا سەعیدی مەلاقادریشی لەگەڵ بوو ، کەرۆێن ئەوفانۆسی لە گەڵ خۆی نەدەگیرا ، زۆر تاریك بوو فانۆسێکمان دایە دەست أحل ، منیشی بۆ ماڵی خۆیان ئەبرد گەینە قوڕوچلپاوەکەی کۆلانی حەمامی مفتی ، لەوێ مەلاسەعید وتی : کوڕە کابرا تۆشەرم ناکەی پێش ئاغات و نەقیب ئەکەوی • أحلم أحل چوە سەر دارێ نەهاتە خوارەوە ، هەرچەندمان کرد پێشمان نەکەوت ناچار گیرامانەوە •

## تێلەکەی بێ گیرفان

مەئمورێك دەستێ جلای وەستا لەحمەدی خاڵە ئەکا ، کەتەواو بوو بۆی ئەنێرێتەوە ماڵەوە ، تەماشائەکا ، تێلەکەکە گیرفانی بۆ

نەکراوە ، زۆری لا ناخۆش ئەبێ ، روو ئەکاتە ژنەکەی ئەڵێ :
چاوت لێیە ئەم وەستایە چەن بێ‌گوێیە هیچ گیرفانی بۆنەکردووم
ژنەکەیشی ئەڵی : جاقەیناکە ، تۆیش ئاخری مانگ لەبەری کە کە
پارەت پێ نامێنێ •

تــۆ بلێی کـەسێـکـت نـەمرێ ؟

مشتەری : وەستا ئەمە لەو قوماشە نی‌یە کە پیم وتی
وەستا : بە سەری تۆ ئەوە
مشتەری : بەخوا ئەمە لەو نی‌یـە ، مـن وتم : لاجیوەردی بـێ •
کەچی ئـەمـە رەشــــە •
وەستا : قەیناکا قوربان ، رەشیش بەکەڵکت دێ بۆماڵانو ئاهەنگ
دەعـــــوەت •
مشتەری : بەڵام من ناچمە ئاهەنگ‌وشتی وا ، قوماشی رەشم ناوێ•
وەستا : بۆچی ناتەوێ بەگم تۆ بلێی کەسێکت نەمرێ •

## ترازووەکەی منی خواستووە

بەقاڵ بە ژنەکەی ئەڵێ : ئەمڕۆ گزشت لـە قەسـابەکەی خۆمان
مـــــەکـــڕە
ژن : بـــۆچـی
بەقاڵ : چونکە ترازووەکەی منی خواستوە بە ئەمانەت •

زنی بێ هـۆش و چـاو برسی

ژن : ئەمشـەو بـۆچی وا درەنگ هاتیتەوە

مێرد : وس‌بە ، کەسێک ‌سەوە لە کـۆڵانێکی تاریکدا دزێك بـــە خەنجەرەوە هەڵی کوتایە سەرم وتی : یا پارەکەت یانەتکوژم

ژن : جەڵەت تۆیش ئەوەندە کەر بوویت پارەکەت دایە ، وانا ؟

وا بزانن دووکەس پێکەوە پەنجا دیناریان دزیوە ئاخۆ یەکـــی چەندیان بەر ئەکەوێ . قوتابی : یەکی دووساڵ حەپـــــی .

## بەهەشتو فریشتەی نەگمەکە

کوردێك گوێ لە مەلایەك ئەگرێ ، مەلا دادی ستایشی بەهەشت ئەدا ، ئەڵێ : ئەوەی تیایە ، ئەمەی تیایە کەنیزەك و بەچەو شیرو شەکرو ئەمانە . کوردە دەپرسێ : ئابرا بوخوا تۆ دەنگ ، پووشی لەوەڕی پەزەکانمی تیایە . مەلا : پووش چی ئەکا لە بەهەشتـــا

کوردەیش لووتێکی لـێ بانەداو ئەڵی : ســا گشـتی وە گ . . . وەللا ئەو بەهەشتە کە کوردی تیانەوێ قەت نامەوێ جەهەنـــەمی لێ پڕ بە فینەوە . ئنجا مەلا هاتە سەر نوێژ وتی : ئەمشـــــەو لە نیوەشەو بەدواوە هەر کەسێ دوو چەوتە (رکـەعەت) نوێژ بکـا و ئەم دروودە لە دیداری پێغەمبەر ... خوا فریشتەیەکـی بەهەشـتی ئەداتێ ئەوەندە جوانو کەڵەکەت سەری لەرۆژ ئاواو لنگی لـــــە رۆژ هـــــەڵات .

دیسان کوردە ئەڵێ : مامۆستا : وەك بەهەشتەکەتم گەرەك نەوەو فریشتەکەشم ناوێ ، تا بۆ ماچ کردنێکی بچـمە رۆژ ئاوا ، لـەرۆژ هەڵات هەرچی لێ بکەن ئاگادار ناوم .

### مانەمــــی مەلا بــۆ کێیــە ؟

رەش پۆشی نیشانەی ماتەمە • رۆژێ مەلا کەوایەکی رەش لــە بەر دەکا ، ئەپرسن مەلا ! خۆ شکور کەســت نەمردوە ؟ مەلایشــ ئەڵێ : خۆم کەسم نەمــردوە ، بەڵام کوڕەکــەم باوکــی مردوە •
رۆژێکی تر مەلا ، ژنەکەی بەزۆر ئەینێرێ بۆ دار ، لەکێو لێکــی ئەداتەوە داری وردی درەنگ بۆ تەواو ئەبێ ، ئەچێتە سەر دارێکی گەورە لقێکی زل ببڕێتەوە خۆی لە سەر لقەکە ئەوەستێ ، بــە تەور لە بندا ئەیبرێ شلپ ئەکەوێتە خوارەوە •

## سەگ بەردراوەو بەرد بەستراوەتەوە

شاعیرێك ئەچێتە ماڵی پاشایەك لە زستان ئەبێ ، سەگ پەلامــاری ئەدەن ، دائەنەوێتەوە بەرد هەڵگرێ ، بەردیش ئەیبەستێ بۆی هەڵ ناکەنرێ ، بەهەزار حاڵ دەرباز ئەبێ ، ئەچێ کاغەزێ ئەنووســـێ بۆ پاشا ئەڵێ : بەراستی پاشایەکی داد پەروەری : بەردت بەستۆتەوە سەگت بەرەڵڵا کردوە •

### بــە دەمــانچــە شەیتان ئەکــوژێ

حاجیەك لەمینا دەچێ رەجمی شەیتان بکا ، ئەبینێ بە بــەردی وردە رەجمی دەکەن • ئەڵێ : چۆن ئەمە ئەو شەیتانەیە ئێمەی لــە بەهەشت دەرکردو خەریك بوو حەزرەتی ئیسماعیل تەفرە بــدا ؟ ئێوە بەردە وردەی پیا دەماڵن ؟ سا چاوم لێ کەن ، دەست ئەداتــە دەمانچە تەق تەق دێت شەیتانیان بۆ بکوژێ ، رەفیقەکــانی خــۆی

بریندار ئەکات .

## بە هەنگە شەلێ نوێژ ناکرێ

مەلا رۆژێ دەست نوێژ ئەشوا ، مەسینەکەی ئاو کەم ئەگرێ بەشی دەست نوێژ ناکا پێیەکی ئەمێنێتەوە تەڕ نابێ ، کە نوێژ دائەبەستێ پێیەکی بە حەواوە ئەبێ ، لەسەر پێیەك رادەوەستێ ، کە دەچێتە رکوع شلپ دەکەوی . ژنەکەی پێی پێ دەکەنێ ئەڵێ : مەلا چیە ؟ مەلایش ئەڵێ : ئافرەت پێیەکم نەشتبو دەست نوێژی نەبوو لەسەر پێیەك ئەوەستام کەوتم . ژنەیش وتی : مەلا! بە هەنگەشەلێ نوێژ ناکرێ .پیاو لەسەر دوو پێو جانەوەر چوارپێ

## غەڵەت بەقەمە ئەکرێنێ

مەلا لە مزگەوتا ئەخوێنێ ، قەمەیەکی ئەبێ لە ژێر جبەکەیا ئەیکا بە پشتیا ئەو وەختە ـ دوور لە ئێستە ـ چەك یاساغ ئەبێ ، رۆژی قەمەکەی ئەگرن . هاوار ئەکا : باوکم ! ئەمە قەڵەمبڕە غەڵەتی پێ ئەکرێنم . ئەڵێن : چۆن غەڵەت بە قەمە ئەکرێنرێ ؟ ئەڵێ : بەخوا غەڵەتی وا گەورە هەیە مەگەر بە قەمە بیکرێنی

## لە توونی حەماما خەیاڵ

شێتێ بوو جبەتەوڵ بەگزادەیان پێ ئەوت داڵ فێستێکی وەك فێسنە چڵکنە کونەکانی منی لەسەردا بوو لە توونخانەی حەمامی موفتیدا ئەنوست . بەڵام چۆن نوستنێك ، خۆڵە مێشەکەی تەخت کردبوو ، وەك تەختی قاجاری پاڵی لێ ئەدایەوە ، هەمیشە

جکەرەیەکی لە بەینی گوێ و قیستەکەیدا دائەنا و جگەرەی دائەگیرساندو ئەکەوتە خەیاڵی مەبعوثی‌یەوە ، ئێمەیش لەسەر توونی حەمامەکە مووشێنمان ئەکرد ، عەزەی حەمە ورچەوان ڕۆژێکیان‌لەکلاورۆژنەی توونخانەکەوە بەردە بارانی‌کرد،لەدەماخی دا ، ڕای کرد هاتەدەر ، ترساین وامان زانی لە ئێمە ئەدا ، کەچی هیچ لەگەڵ ئێمەی نەبوو ، ڕووی کردە ئاسمان وتی : بەشەریکی خۆتم ئەزانی ، وا لە توونی حەمامیشا خەیاڵم پێ ڕەوا نابینی و بە کوڕە ورچەوانێ لێم ئەشێوێنی .

نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆقەساب

دارتاشێ لە ناو کاروانێکدا ڕووت کرا ، تەنها تەشوێیەکی بوو لێیان‌سەند ، بۆی دەگریا . بازرگانێ‌حەوت بار کووتاڵی برابوو لێی پرسی : من ناگریم ، تۆ بۆچ ئەگریت . وتی : بۆتەشوێکەم ناگیم بۆ ئەوە ئەگریم سنعەتکار نین و دەمەسوێی ئەکەن .

چاوەڕوانی مەرگ

ساڵانی پێشوو ئەم عەشایەرە هیچ ئامەشۆو ڕەفتی شاریان نەبوو؛ هەرچۆنێ هۆگری ڕەوشتی کەژو کێوی بوو بوون وا دەژیان ، پیاوێکی زۆر ڕاست گۆی تیرە گیراویەتەوە جارێ ئەچێ بۆ شارەزوور ئەبینێ لە بنەی سیدصادق قەڵەباڵغێکی لێ کۆبۆتەوەو قەبر هەڵ ئەکەن . ئەمما لە قەبر بان ترو قوولتر پێنج شەش دەستەکیان داناوە سەری پێ بگرن . پیاوێکی ڕیش سپی دانیشتووە

نان و ماست ئەخوا • لەپیرەمێرد ئەپرسێ : ئەو قەبرە بۆ کێیە ؟•
پێی یەڵێ : قوروان بۆ منە • جا تۆ نەمردووی چۆن زیندە بـــە
چاڵت ئەکەن • یەڵێ : کێوساز سەختە وەبێ ناتوانم‌بڕۆم • لە گرا
جێم تێڵن ، ئەمیشە ئازوقەمە ئەگەر تاتێەوە مام لە تەکیانا ئەچم بـۆ
گەرمیان ئەگەر نەیشەمام وا جێی خۆمە •

## بانگ دانی مەلا

مەلای مەزبوورە هەر چەند بانگ ئەدا خێرا بەدەم بـانگەکەوە
رادەکا ، خەڵک لێی دەپرسن بۆچی رادەکەی؟ ئەڵێ بابزانم‌دەنگم
ئەگاتە کوێ ، لەهەر کوێیەک دەنگم ئەبڕێتەوە لەوێشەوە بـانگێکی
تر ئـــەدەم •

## فیل مـــەیموون

هیندییەک زنو مالی نابێ تەنها مەیموونێکی ئەبێ حزمەتی ئەکا
رۆژێ گۆشت ئەکرێ مەیموون لێی‌نێ ، لەلەزەمیلەدا ئەبێ قەلێک
ئەیفرێنێ ، مەیموون سەری خۆی ئەخاتە ناو زەمیلەکەوەو سمنی
ئەکاتە حەوا ، قەل وائەزانێ گۆشتەو دیســـان بیفرێنێ دای دێتێ
مەیموون قەل ئەگرێو سەری ئەبڕێو بۆ ئاغای لێ‌دەنێ • ئاغای
ئەیخوا بادار ئەبێ زۆر بای ائێبەر ئەبێتەوە ، مەیموونیش شەونە
ژێر لێفەی ئاغادا ئـــەنوێ بۆن ئەچێ بەلووتیا نارەحەت ئـــەبێ
ناچار هەڵدەستێ مارێچی تێرگەلەی هیندی سەرەباریکەکەی ئەخاتە
کوونەبای ئاغایەوە ئەو سەرەکەی تری لەژێر لێفەکەوە دێنێتە دەر

لە پەنجەرەوە ئەیخاتە کۆڵان •

## مشتووی ناو هەمانـــە

هارون الرشید شەوێ بەست ئەبێ ، پیاوێکی بانگ ئەکا ئەڵێ دوو قسەی خۆشم بۆبکە پێ‌بکەنم ۳۰۰ دینارت ئەدەمێ ئـــەگەر نەتهینامە پێکەنین بەم هەمانەیە سێ هەمانەت پیا ئەماڵم • کابرا دەڵی ئەی خەلیفە من خۆم بەڵێن نادەم بەلام یەکێکت بۆ دێنم بتهێنێتـــە پێکەنین • • هارون دەفەرموێ : ئەویش باشە • کابرا دەچێ جوو جەیەکی بسنە بالای چل‌گەز ریشەی بەناوبانگ دەبێ پێی دەڵی وەرە دەتبەمە لای خەلیفە ئەگەر هێناتە پێکەنین هەرچیمان دەســت کەوت سێ‌یەکی بۆتۆ • جووجە دەڵی : خێر بـــەنیوەیی • ئنێ جوجەهەرچەن گاڵتەوقسەیەکی خۆشی‌لەهەمانەدا دەبێ خەرجی‌دەکا خەلیفە پێ ناکەنێ • دەفەرمووی : هەمانەیەك بێنن ، مشتەیەکی بە دزی‌یەوەنێ‌دەخەن بەهەموو زۆری خۆی‌یەکێ دەماڵی بەجووجەدا هاوار ئەکا رەفیقەکەی ئەڵێ : بەهەمانەیەك بۆچ هاوار دەکەی ؟ جووجە دەڵی : یاخوا بەنسیبت بێ مشتەی ناو هەمانەیە • لـــەپاشا هاوار دەکا:ئەی خەلیفەی موسڵمانان ! ئەم زاتە موبارەکە هات وتی هەر چیمان دەست کەوت سێ بەتی بۆمن بێ ، وامن سێ‌یـــەکی خۆم وەرگرت بەسمە • دوو بەشەکەی تری بۆئەو بێ • خەلیفـــە ئینجا پێ‌دەکەنێ‌و یەکێکیش ئەکیشێ بەپشتی پیاوەکەی خۆیا هاوار ئەکا : ئامان خەلیفە منیش بەسێ‌یەك رازیم •

## بینیرنه مالی خالـــوی

پیاوی کوڕێکی بوو ژنی بۆ هێنا ، کوڕه ئادەمات لەرو بێهێز دەبوو باوکی کوڕه بەدزی‌یەوە رای سپاردە لای ژن براکەی خۆی که خاڵی کوڕەیە بنێری بەشوێنیا چەن رۆژێ لـەماڵی خاڵی بێ • خاڵۆ ناردی کوڕه هات چەندێ لەوێ بوو بووژایەوەو هاتەوە بۆ ماڵی خۆیان ، لەرێ تووشی بزن گەلی بوو دەمەو پایز بوو وەختی ئەگە ، سابرێنی زۆر پەربو لەڕو لاواز ، کوڕه پرسی ئەمە بۆچوا لەڕە ، شوانە وتی : زۆر پەربوە • کوڕه وتی : بنێرنە ماڵی‌خاڵۆی

## بەشکردنی نـــارەوا

یەکێ لە ساف دەروونەکان پیاوێکی بۆرەکەیی دەبێ پـــارەی ئەداتێ ئەڵی : بچۆ لە بازار پێنج خەیار بکرە پێکـــەوە بیخۆین • کابرا سێ خەیار دێنێتە بەردەمی دەڵی : تۆ فەرمووت بیخۆین مـن شەرم ئەکەم لەگەڵ تۆ بیخۆم بابەشی کەین • ئاغا دەڵی : برا من وتم : پێنج خەیار بکرە ئێستا سیانە : بۆرەکەیی دەڵی : ئـــاغـا پێنج بوو • بەلام یەکی هەر نەبوو ، یەکی لــــەرێ تینووم بوو خواردم • با ئەم سیانە بەش کەین : یەکێکی بۆ من ، یـەکێکی بۆ تۆ ، یەکێکی بۆمن • ئەگەر یەکێکی تر بوایە ئەوا بـەر تۆ دەکەوتە •

## گـــەوج

خەری پیاوی حاجی حەسەن ئـــەفەندی رۆژی رەنجبەرەکەیان

نەخۆش ئەبێ پێنج گوی درێژی ئەدەنێ بیا بۆ کانی بەردینە لەوێ
کایان بۆ بێنن ، کەئەروا ئەڵێن : خدر ئەوە بەژمارە پێنجن هیچت
لێ گوم نەبێ • سواری یەکێکیان ئەبێو چواریان ئەداتە پێش خۆی
لەرێ دێتەوە بیری ئەبان ژمێری چواری لەپێشەوەیە • ئاخ دەڵێ
یەکێکیان دیارنی‌یە ، جارێ بزانم لە دواوە بەجێ نەمابێ لەتاوا
گورج دادەبەزێ و بەرودوا رادەکا هیچ نابێ ئەگەرێتەوە دەبینێ
پێنجن تەواون • لەترسا ئیتر سوار نابێو ناچی بۆدێ ئەگەرێتەوە بە
حاجی حەسەن ئەفەندی ئەڵێ : ئاغا ! گوی درێژ شەیتانە لەگەڵی
نارۆم بەرێدا یەکێکیان خۆی لێ کردم بەجنۆکە گوم بوو نەواوکم
کەوت هێند رام کرد بەشوێنیا گەرام کەچی لەناو رەفیقەکانیا بە
کاڵە خۆی لێ شاردبوومەوە • لە جیاتی ئەوە ..مەدەرە
ئیشێکی رەسمی بزانە چەندت بۆ دەخەڵەتێنم

نوێژە ئاویلکە

مەلایەك ئەبێ هەرگیز نوێژ بەبێ جەماعەت ناکا ، دەفعەیەك لە
چۆڵێکا وەختی نوێژ دەبێ کەس نابێ لەپشتیەوە نوێژ بکات‌شوانێکی
چاو پێ‌دەکەوێت ، ناچار ئەڵێ شوانە وەرە نوێژی جەماعەت‌بکەین
شوانەش بەکلاش‌و فەرەنجی‌و گۆچانەوە هەڵ ئەکوتێتە سەربەرماڵ
مەلا ئەڵێ شوانە وانابێ بچۆ دەست نوێژ بگرە ئەوجا وەرە
قرانێکت ئەدەمێ • شوانە ئەڵێ نوێژە ئاویلکە ئەڵێی بەخوا بە
هەزار قرانی ناکەم •

## شـــێر و ڕیوی

شێرێ پیر بووبوو نەیئەتوانی شکار بکاو لەبێشەکە نەدەهاتــە دەر ، لەترسی ئەویش کەس نەیدەوێرا بچێتە ناو بێشـــەکەوە . ڕێوی قەرە قولاخ پێش خزمەتی بوو هــات گوێدرێژی گازریکی تەفرەدا وتی : وەرە ئەم بێشەیە لەوەری خۆشە . گوێدرێژ وتی: شێری تیایە . ڕیوی وتی : ئەوە تەلیسمە بۆیە کراوە کەس نەچێ لەوەری نەخوا . تۆ وەرە من لەپشتەوە دەڕۆم پێشــ کەوت چوو قەدەرێ خۆی لەشێر هەڵسوو ، شێر لە پێشدا ڕێوی پێی گوتبوو هیچ جمی نەدا تاکەر هاتە بەردەمی پەلاماری دا پیربوو بۆی نەگیرا کەر ڕای کرد . ڕێوی چوو بــە شوێنیا وتی : تۆ پێت نابــــــە تەلی تەلیسمەکەدا بۆیە جوولا تۆ ئەم جارە پشتی تێکە و بلەوەڕی هەرچۆنێ بوو ئەمجارەیش تەفرەیدا بردیە بەردەمی شێر شکاندی شێر وتی : دڵ و گوێ کەی بۆ من بێنە بیخــۆم . ڕێــوی خــۆی خواردبووی وتی : ئەم کەر. دڵ و گــوێی نــەبوو ئەگــەر دڵــی بوایە تەفرەی نەدەخوارد ، ئەگەر گوێشی بوایە لەپاش ئەمەیکە شێری بە چاوی خۆی دی پەلاماری دایە بەقسەی مــن فریوی ســە دەخوارد . . . هەرچەند ئەمەخەرافاتە ، بۆ ئێمە هەرکات ئەوکاتە

### کــــەڵاڵی و دزی

کابرایەکی کەڵاڵی لە دزیدا زۆر چالاك و بێ باك دەبێ، هەمیشە مەیی دزییەتی بوو ، بۆ مەلای خێڵەکــەشیان جار جار گۆشـــتی

دەبرد • مەلا جارێکیان پێی وت : تۆ ناترسی ئەم هەموو حەیوانە ئەدزی جارێ بگرن ؟ وتی : لە شوێنێکی نادزم کە کەس ئاگای لێ بێ • بەچی مەحکومم ئەکەن ؟ وتی : ئەی لە خوا ناترسی ؟ وتی : کە شایەت نەبێ لەبەینا خوا بەچی مەحکومم ئەکا ؟ مەلاوتی : ئەو مەڕە زیندو دەبێتەوە شایەتیت لێ ئەداەوتی: جا کە زیندوو بووەوە منیش زۆر چاك گوێی ئەگرموئەیدەمەوە دەست خێوی •

## لالۆ سەرحەدو غەزا

لە زەمانی پێشوودا مەلاکان دڵخۆشی لالۆ سەرحەد ئەدەنەوە بچێ بۆ غەزا • پێی ئەڵێن : بڕۆ بۆ غەزا ، ئەگەر کافرەکان بکوژی غەزایە خوا جەزای بەخێرت ئەداتەوە لەبەهەشتا • ئەگەر ئەوانیش تۆیان کوشت ئەوا شەهیدی ، دەچینە بەهەشتەوە خوا چل حۆریت پێ ئەبەخشێ • تەعریفی خواردن و خواردنەوەکەیشی بە نەوعێ بۆ ئەکەن ، تافریو ئەخواو ئەڕوا بۆ غەزا • پێی ئەڵێن ئەو حۆری‌یانە ئەوەندەی هەموو ژنی ئەمدنیایە جوانن•لالەسەرحەد چوو بۆ غەزا ، ژنێکی بوو ناوی پیرۆز بوو بەجێی‌هێشت •وا ڕێکەوت لەغەزادا بریندار بوو هاواری ئەکرد : ئەی مەلاکان وا، واتان لێ بێ بەهۆری هۆری پیرۆزیشتان لە کیس دام • من باوکم هۆری بوو ، باپیرم هۆری بوو کێم هۆری بوو ، چیم لەهۆری‌دابوو ئاخ چ پەندێکتان پێ‌دام •

# قالــــه سوری جانباز

زه‌مانی سولتان حه‌مید پایه‌و شوین‌و نیشان وه‌ك پیاتقۆوابو بــــه ناوی هه‌ر که‌سێکه‌وه ده‌رچوایه ئه‌بو به‌یه‌کشه‌وه ، چونکــو خۆی فه‌رمان ره‌وای به‌که‌م و سێبه‌ری خوا بو له‌سه‌ر زه‌وی ، سه‌ر‌و‌ماڵ هه‌موو هی ئه‌و بو .

رێکه‌وت وابو کوردێکی که‌رکوکی‌ره‌شیدی ناوبو ، زۆرزیره‌ك له قوتابخانه‌ی شاهانه به‌یه‌که‌م ده‌رچوبو بردیانه ( مابــــه‌ین ) بو به باشکاتب ، ئه‌دوای به‌ینێك خاڵۆیه‌کی بو له که‌رکوك قاله‌سوری جانبازیان پێ‌ئه‌وت ، له مه‌یدانه‌که‌ی ئه‌م‌به‌ر خاسه‌وه به‌یانیان گوێ درێژو ئه‌سپو تیسترو گای هه‌راج ئه‌کرد ، بۆسه‌یر بانگی ئه‌کرد ( هه‌راج : شه‌ل‌دز ، سقطدر ، کوردر ، مانگردر ، کوێری کچمز در ، به‌لام به‌ختی أیدر ) له‌پر ته‌لغرافێك له اراده‌ی سنیه‌وه بۆ والی موصل هات ئه‌ڵی ( عبدالقـــادر باشای خاڵۆی رشید بگ ی باشکاتبی مابه‌ین له‌سه‌ر نه‌فه‌قه‌ی حکومه‌ت بنێرن بۆ ئه‌ســته‌موڵ ) عبدالقادر پاشا له قاله سوری جانبازه‌وه روتبه‌ی پاشایان دایه‌و بــه که‌شتی‌و فشێکه‌وه گه‌یه ئه‌سته‌مول‌و جلی مابه‌ین‌و فۆرمه‌ی پاشایی له‌به‌ر کرا،خوا هه‌ڵناگرێ خۆیشی زه‌لامێکی که‌ڵه‌گه‌تی چوارشانه‌ی سوور‌و سپی بو سه‌رو ریشێکی جوانی پێوه‌بو به‌سێ رۆژمه‌شـقی سلاو‌و کرنوش فێرکرا ، بۆ رۆژی چواره‌م پێشکه‌شی باره‌گای پاشا کرا أراده ده‌رچو بیکه‌ن به‌قائمقام . به‌لام ناظری داخلیـه

هێشتیەوە چونکو مەخوێندەوار بو ، رەشید بەگ عەرضی پاشـای کرد ، ئەویش لەقینا أرادەی متصرفی ( حدیدە ) ی لای‌یـەمەیان بۆ دەرکرد • سـەعید بەگی عەفجان بەگیش بۆ خەلقی لای‌خۆمان ئەویان هێنابو امزاو حەواڵەیان بۆ بکات کردیان بە مـدیر تحریرو کچی قادر پاشایان لێ‌مارە کردو لەگەڵیان نارد ، کە گەیینە(حدیدە) پاشا مەراقی دایە مرواری‌و مجەوهەرات بـەهەموو رەنگێك کۆی ئەکردوەوە سەید بەگیش پارە ، بەلام متصرف مەراقێکی لە دڵابو روزێ بەسـەعید بەگی وت : رۆڵەکەم وەرە وا خۆهەموو شـتێکم داوەتە دەسـت تۆ ، هەرچیش ئارەزو هەیە بیکە تۆش ئارەزوی‌من بەجێ‌بێنە • دو گوێ درێژم بۆ بکرە بەیانیان زو من لەحەوشی‌نەو دیوەوە بەتورەیی‌بەوەئەیاندەمە پێش‌بەزمانی خۆمان هەراجیان ئەکەم خزمەتچیەکان خۆیان بگۆرن‌و بێن سـەودای بکەن‌و لێم بکرن‌دوای تۆش وەرە لێم تورە بەو بلێ : ( مالـی‌اوجوز صاتوب سن پـارە چالوب سن ) نەختێ لە سـەرو پۆتلاکی یەك بدەین بەوە تەسەڵای دڵم دێت بەم رەنگە چوار پێنج مانگیان بردە سـەردوایی سـەعیدبەگ وتی بەخوا ئەم شـەرە کەرو گوێلەزە بەمن نـاکری ، بۆی دەرچو قادر پاشـایان هێنایەوە بۆ ئەسـتەمول •

ـ نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب ـ

## کەریشم چوو خویشـم چوو

کاتێ کە دەوڵەتی عوسـمانی لەروی کاردا بو ، وەك ئێسـتـــا

شەمەندوفەرو ترومبێلو لۆری پێویستی هاتو چۆ کردن نەبو هەر گا پێویست بوایە عەسکەر بچێ بۆ شوێنێك حەمە خێلو قالەی هەمزەیان ئەخستە ناو شارەوە هەرچی گوێ درێژ هەبو هەرکە باری لێ‌فرێ ئەدرا کوپر ئەیان دایە پێش‌و ئەیان برد بە(سوخرە) بروپاتالی عەسکەریان لێ‌ئەناو پێ‌یان‌ئەوت ( سوخرەی کەر ) ئەگەر پێویست بوایە پیاویشیان بەزۆرە ملی رائەکێشا بۆ بێگار ئەویش ناوی ( ئەنتاریا ) بو .

کابرایەکی دۆلەسوری لەپێنجوین کەمێکی خوێندبو هات‌ئیمامەتی بو شیخ سمایلی بنەجوت بکا ، هیچیان نوێژیان‌نەدەکرد ، ئەمیش هەمو ئێوارە بەزۆر هەڵی ئەبێچان ئەی گوت : ( عەشرەت نوێژە بێنەوە ) دوای هێندەی لێ‌بێزاربون شکاتی کوێخا حەمە خانیان لێ کرد ، حەمە خان خۆی نوێژو موێژی نەئەزانی ، وتی : بڕاگەل بێن ئەم تەوقە لەمل خۆمان دامالین ، خۆم ئاگام والێ ، بێ‌وسڵو دەست نوێژ سەر مللایتان بۆ ئەکا ، بابە پیتاك کەرێکی بۆ بسێنین کاروان بکاو وازمان لی‌بێری ، وتیان دروستە کەرێکیان بۆسەند دەستی کردە کاروان ، شانی سواو کەلاشی درا ، مالو منالی پێ بەخێو نەئەکرا ، رۆژی لە خەرمانی بالاتەران باری کای بارکردە هاتە شار دەس بەجی لەناو شارا بارەکای لێ داگیر کراو وتیان‌بە بارەکامان بۆ فوڕ ئەوی . خەریکی ئەوەبو بچێ دادی بارەکا بکا حەمە خێلی گەیشتە سەر کەرەکەی برد وتی : عەسکەر بۆمەرگە

ئەچێ ( دە شێخ سمایل تۆ لەکوێو مەرگە تۆ لەکوێ ؟! ) بۆی نەکرا لەگەڵ کەرەکەی بروا ، هات بگەرێتەوە بۆ دێیەکەی خۆی قیر خرەی بەلەدیە گرتی. وتی : کابرا دیواری حەپسخانە روخاوە فوریێ بۆ ئەگرنەوە وەرە تۆش ئاویان بۆ بکشە، بەتێهەڵدان بردیان تیوارە بەرەڵلا بو هاتە مزگەوتی مەلا أوضای رەش مەلا عومەر لەوێ بو • کابرا خەریك بو ماندوی خۆی بحەسێنیتەوە مەلا عومەر وتی : راستەوە بە نوێژەکەت بکە وتی برا حەقتەزۆرم بە خەلك وت نوێژ بکەنو نەیاز کرد واخۆم پێم ئەڵێن : نوێژبکە بەلام کارێکی پێنەکردوم روی بێ بلی نوێژم بۆ بکە •

مەلا عومەر لەی تورە بـ دەری‌کرد • ماندو مردو برسی مەلا عوبید بردیە ماڵی خۆیان نانی دایەو دڵخۆشی دایەوە وتی بـرا دڵتەنگ مەبە خوا کەریمە • • وتی مەلا عوبێد تۆخۆت قسەت خۆشەو حەز لە قسەی خۆش ئەکەی توخوا تۆبەمن بیژی خوا حسابە • ئەوسا کەریشم بو ، خۆیشم بو مرحوایشم بو لێم‌نەرەنجا بو گوزەرانم نەئەکرد ئێستا کەریشم چو خۆیشم چوم ، خوایشم چو ، وادیارە ئیم رەنجاوە ، هێشتا ئەوەندە کەر بم بەدڵخۆشی تو دانەوەی تۆ دڵم خۆش بکەمو گوزەران بکەم •

## بــاوکم ساقو سەلیم بوو

رەمەزانان فەقێی مزگەوتەکان بەسەر دێهاتا بڵاو ئەبنەوە پێش نوێژیان بۆ ئەکەن ، دوایی کە جەژن هات هەر کەس سەفطرەی

خۆی پێ لەقەبڵێتێ بموە خەرجیەکیان دەست ئەکەوی . . بەلێك
لەم فەقیریانە ئەچێتە دێی ( بنە جوت ) کوێخا حەمەخان هــەتێ
ئەیتچێ فێری نوێژی ئەکا ئەویش کەتەپیرێکی تەنگە ئەستور ئەبێ
زۆر تواناى هەلس وئیست و ڕکوع وسجودی نابێ لە هەڵسانەوەدا
ڕیخۆڵەی لەبسێ ئەمرێ . . . کورەکان حەســەن و ســەعدون و
براخاس مەلا ئەگرن خەریك ئەبن بیکوژن قادرزاڵەی موان بـ ـە
هاوارەوە ئەچێ سەعدون ئەڵێ : باوکم ساغ وسەلیم بو ئەم پیاکــە
تەرتیبێکی فێرئەکردوەك جلەرای ئەگرد،وەك کۆمانچ ئەیچەوتانەوە
کنگەوتلور ئەی خست تاتراندی وەگۆری باوەیا . قادر زاڵــەیش
ئەڵێ برا هەرچی چو چو وازی لێ بێنە سزای کوشتنی ئەم پیاوەش
بۆ لە قیامەتا ئەچێژێ ، تۆ نوێژ مەکە ، کــەمردی وەســیەت بکــە
لیسقانەکەت بدەن بەمن بەکاڵەو پێتاوەوە ئەچیە بەهەشت .

## یــەك ناو ببینەوە

کورد لەمێژەوە قینی لەناوی درێژە ، بەڵکو ڕاست وڕەوان،یاخو
ڕەپ وڕاست حەز لەناوی کورت وبچوك ئەکا تیرەو ڕەگەزی کورد
خواهش وئارەزویان لەسەر ڕاستی ودروستی بوە .

لەزەمانی پێشودا کاتێ کەحاف گەرمیان وکوێستانی ئەکرد هەتــا
دەوری سنەو سەقزو تیکان تەپەی هەوشار . ماڵــە جــافەکان بــۆ
لەوەڕ خۆری ســەرەوژور ئەڕۆیشتن ، ڕۆژی لە هاوینا کــە خێڵە
جافێك لە دەورویشتی سنوری ( سنە ) ماڵ هەڵ ئەدا،پیاوێك یاخود

میرزایەکی ئیرانی ئەویش لەئیرەو پەگەزی کوردی(کوردستان)ی
سنە بو ، بەمیوانی دێتە ماڵی کوێخا ناوی (میرزادمقکا) بوە خاوەن
ماڵ لێی ئەپرسێ برا ناوت چیە ؟ میرزا لە وەڵامدا ئەڵێ : (فدوی)
فەرمایش ئەفەرموی ،لەهەندێ محافل‌و مجالسداله‌بەر نکتە سەنجی
وشیرین زوبانی مەردوم گەل وە(ئاغا میرزا غولام محمد حسین آقا
شکرەگیانی)ناوم ئەبەن . . . کوێخا دیارە لەم‌بەندو باوە تێ‌ناگات
بەڵام ئەوەندە ئەزانێ کەئەم ناوە زۆر درێژە ، ناچار بەرو گـرژی
رو ئەکاتە میوان ئەڵێ : دەویت واوك ئەمە ناو نەبـو تـۆ هێنـات
وەناودا ، هەرسێ تەڵاقم کەوتبێ ، تالای ئەومەڕانە دێمـەوە یـەێ
ناو نەبینیەوە دوپارچەت ئەکەم‌و دایکت لەکەر ئەکێشـم . . . لـە
لای مەڕەکان دێتەوە ئەپرسێ : کورە کمران باوگاو نـاوت چیە ؟
ئەڵێ (محمد) کوێخا ئەڵێ جا باوە خێر کە تۆ ناوت (حەمە) بو ئەم
ریس‌و کوریسەت‌لەچی بـو ؟ بێژە حەمە ، بێژە حەمە کـابرای
میرزا پێی لێ ئەنێ کە ناوی حەمەیـــە .

## نـۆ کـەری گەلحـــۆ

پیاو ماقوڵەکانی دەوری بابان زۆرتر هـەوڵی ئەوەیـان ئـەدا ،
خزمەتکاری ئازا ، وڵاخی رەسـەن ، شیری جەوهەردار ، تولـــەو
تانجی بـــەکاریان بێ ، هەندێکیشیان پێش خزمـــەتی زیرەك‌و
شیرین جوابیان بو .
رۆژێك یەکێك لە ئاغاکان لەسەر دەعوەت ئەیێ کەئەن ئـــەخوا

دەنگی برنج بەریشیەوە ئەبیتی • خزمەتکارەکەی پـــەتوکە تێی ئەگەیەنێ ئەڵی : ئاغا سەدەفێکی سپی کەوتۆتە ناو باخی رەشـــە ریحانەوە بۆ ئەوەی نازی بێ ، ئاغا گورج تێ ئـەگا دەنگێ برنج کەوتۆتە ناو ریشی ڕەشیەوە ، دەست ئەبا فرێی ئەدا ، ئاغایـەکی تریش بەخزمەتکارەکەی ئەڵی مەسینەکەم بۆ بەرە.ئەدەبخانەکە ، بەو بیابوانەوە بانگی ئەکا پێی ئەڵی ئاگات لێبو خزمەتکاری ئەو ئاغایە قسەیەکی چەن جوانی کردو بەئیشارەت تێی گەیاند کەبرنج بەریشیەوەیە ، تویش وابە ، قسەی واجوانو بەئیشارەت بکـە ، ئەویش ئەڵی لەمەولا بم‌بینە • بۆ بەیانی لە خزمەت پاشای بابان‌دا قاوەڵتی ئەکەن ، ئاغایش بەتایبەتی دەنگێ برنج بەریشیەوە ئەنکێتی بەڵکو خزمەتکارەکەی نوکتەیەکی جوانتر بەختکا ، لـــە وێوە خزمەتکارەکەی برنج بەریشی ئاغایەوە بەدی ئەکا ، بـــە دەنگێکی بەرز ئەخورێتە ئاغا •ئاغا ئاغا یارۆی ئاودەستخانەکەت هاوەسێڵەوە من دەستم پێ‌ناگا خۆتێ خۆت دەستت هەس ، ئاغامی توری دەی هەموو دەست ئەکەن بەقاقای‌پێکەنین ، ئاغا توڕەئەبێو جنێوی‌پێ‌ئەدا خزمەتکارەکەشی ئەڵێ : ئاغا تۆ خۆت رات سپاردم ، بەلام ئەوســـ گو تاوی دابوی هەر هێندەت حاڵی کردم ، ئەگەر زۆرترت حاڵی بکردمایە منیش زۆرترم ئەگوت-•

## قەرال هەی قەرال

ئەلی وەیس ئاخەسوری بو ، پیکورەی جاف ، چەن وەختێك نە

ناو پشتمالەدا خزمەتی ماڵە گەورەی کردبو ، لەو ماڵە بەگزادانەدا فێری پلاو خواردنو چرپو چوپ ببو ۰ رۆژی یەکی لـە کوڕە بەگزادەکان کراسێکی فەقیانە سپی ئەداتێ لەسەر دەرپێی چاوی نەشوراوەکەیەوە ئەیکاتە بەر ، فەقیانەکانی ئەماویتە ملیو بەوگوێ زەلمەدا هۆرەی بۆ ئەکا ، دێ بەخەیالیا ، بەزێ ئەم بەگزادانـە بەسەرو سەنەمە چییان لەمن زیاترە واحوکم بەسەر ئەم ئیلانەدا ئەکەنو ماڵو دەوڵەتو ژنی جوانو خزمەتکارو سیرەی سەماوەرو حیلەی ماینی نەجدو ئەم هەموو پلاوو گۆشتو فرنیوو کومانجەیان هەیە ، باوجود خۆیشیان پێیان ناخوری هەر جیقە جیقیانـــە کە هەڵدەسنە پێ ناتوانن کەوش ،کەنە پێ ئەشێ خزمەتکار کەوشیان بۆ هەڵکێشی ، بامن بیمە بەگزادە بمسنن چۆن کورنك ئەبم ، لەم خولیایەدا ئەبێ ( شاکە هەرچنی عەمەلە ) ئەدا بەلایا ئەبێ : ئەلی وەیس ئەوە هۆرەی چینە ؟ بەزی باوەت مردگە ، ئەڵی ئەزێوەڵە باوکیشو دایکیشم مردوە ، ئەی ئەمە حالە ؟ رۆژ ســـەکمان بێ ئەخەسێنن ، شەو ایشکمان بێ ئەگرن ئەمە بەخێر تیواران کاســە ئەلیسینەوەو زگمان تێر ئەکەین ، وامنیش قەرارمدابیمە بەگزادەیەك لە گشتیان بالاتر ۰ شاکە ئەپرسی : ئاکورە بێفـەر پیمبێژە چۆن ئەبیتە بەگزادە ۰ ئەڵی خاس خاس ، هەزارت بۆ بژمێرم لە شوانی وزاندرمەییو پیاو کوژیەوە بوە بەشاو شاهەنشاو دیکتاتور ئـــەوە نادر ، ئەوە رەزاشا ، ئەوە هتلەر ، ئەوە ئەوانی تر ، ئەوەحیکایەتی

پشوان تۆ بێ لەتەك منا ، کەرتە لەرێ ، بلر گەڕە گەرێ پەیداکەین
چوار ڕێبواری بەسزمان ڕونەوەکەین ، دەی ترمان پێوە بنیشێ ،
بزانە ئەبێ بەچی ، زاتا ئەم وڵاتە گشت بێ کاروبارن لەشسایی و
جەردەیی ئەگەرێن هەر یەکێ راست بێتەوە سەر جەردەیی بکا
هەزاری شوێن ئەکەوێ .

شاکەی هەڵفریوان چون لە گورگەی سەرخلسە دومایێ رەسەی
ئەورەحمان ئاغایان فراند هەر لەوڕێیە چەنـــد ڕێبوارێکیان روت
کردەوە پارەو کەلو پەلیان لێسەندن خۆیان کرد بەشۆرە ســـوار
هەشت نۆ سوارێکی ئاخە سوری چنگنیان شـوێن کەوت کاروانی
بەغدایان روت کردەوە ، هەمهەیەکیان خستە ولاتەوە ، ناوی خۆی
نا ( زەعیم ئەلی وەیس پاشا )خەرج و خەراجی ئەسەند ، پاشـــــا
هەی پاشا ، زەعیم هەی زەعیم ، قەراڵ هەی قەراڵ ، تا رۆژێ لە
قەرەداغ دێیەکیان تالآن کرد شێخ حسین شێخ علی مدیر بو بـــە
سوارەی خۆیەوە شوێنیان کەوت لەوی قراڵی لە قراڵی خست . .
( کێ بە بەدخوی دنیای برد سەر ) .

## نادر ئـــاوینە

کاتێك لەم قەڵەمڕەوی کوردستانەدا پاڵەوانی و زۆران بـــازی و
خەنجەر وەشاندن باوبو ، هەمو گەرەکێکی سلیمانی زۆرخانەیەکی
تیابو بەیانیان زوو نەوجوانانو پیاوی برە ئەچونە زۆرخانە خۆیان
روت ئەکردەوەو بەرگی چەرمی پاڵەوانیان لەبەر ئەکردو ، کۆنە

سوار تویلی زۆربلای لێئەداو ئەماتە جوبنش ، دوای هەڵپەرکێ
و سەنگەو شنۆو میلبازی ئنجا جوتەجوتەشانیان لەیەك ئـــــــەدا
ئەجمین ، جالەو بەیەکدا هاتنە زۆرو پاڵەوانی دەرئەکەوت .

کابرایەکی تیلەکوبی پەیدا بوبو ســـادری ناوبو ، هێزێکی بێ
ئەندازەی هەبو پەنجەی زۆر پاڵەوانی شکاندبو ، ئاوێنەیـــەکی
کریبو ، هەر کاتە ئەکاتی ئاوێنەکەی دەرئەهێناو ســەیری خۆی
پێئەکرد ، ناویان نابو ( نادر گاوێنە )لەخۆی بایی بوبو ، خۆی لــە
گاوێنەی دێوا ئەدی ، ئەمەندەش تر زل بو هیچ کارو کاســـەکی
نەئەکرد ئەوسایە ئایش بەلاش بو هەر کەسێ‌تیواران روی بکردایە
ماڵی هەر کەسێك خاوەن ماڵ پێی خۆش بو دای ئەناو پێکەوەنانیان
ئەخوارد ، بەرگیش هەرزان بو وەك ئیستا نەبو کوستمو کراوات‌ێ
یەخەی قولەو قوندەرەی بلادی . هاوینان کراسو دەرپێی جاور
سوخمەی شەیتان بیزی زەردی موصلو دوگمەو قەیتانی نارنجی‌ێ
لەباتی کەوش پێستی غاراوی ئەستوری بەرێیی . کوڕ هەی‌کوڕ
شەویش لە قاوەخانەی سەرچیمەن موتابخانەیەکی حەمەی سمایل
بو لەوێدا چوار پەلی لی‌رادەکێشا ، جاربەجار سەرخۆش‌وەەرخۆش
بەوێدا راتەبورن لی‌یان راتەپەری روتی ئەکردنەوە . شـەوێکیان
خەنجەرێکی باشو کیسە پارەیەکی پری لە سەرخۆشەکان دەست
کەوت ، بەوە کونە کورتەکێکی ناوداری بۆ خۆی کری‌و یەك‌ێ
دو رەفیقی زۆرخانەی بردە دوکانی حاجی قادر کەبابی دەرخوار

دانو بەشەو دوای خۆی ئـــەحســـن بۆ راوو روتی ناوشار وایان لێهات منداڵ لەبێشکەدا ئەگریا ئەیان گوت ( نادر ئاوێنە ) هات لەترسا زیر ئەبوەوە • زاتا ئەم دنیایە وایە ، هەرچی رەتیکی بەرکەوتو خۆی نواند زۆری شوێن ئەکەوێ • تادوای حەمەرەشی ئەحمەدی ئەورەحمان بەدەستەیەك ژەندرمەی ئاراوە نیشتە سەریان دوانی لە رەفیقەکانی کوشتو ئەودوای تەراندن ، نادریشی گرت هێنای دوای دارکاریەکی باش لە موتابخانەکەی کە کردبوی بـە مەکوی خۆی چوار مێخەی کێشا ، ئنجا منداڵان کە سامیان شکابو ئەچون لە دورەوە بەردیان ئەگرتە گەڵو گونی لەو حاڵەیشـــا هەرەشەی ئەکرد ئەی گوت بۆم راوەستن تا بەهاری ئەم پـەتـــە ئەپچرێنم ، ئێستا چیبکەم خو ( نادر شلی کوتەکە )•

## پاشا ناچێتە ژێـری

تیرەیەك لە عەشائر رەوگیان کەوتبوە ناو دەغلو دانی ئاوایەکەوە زیان کاریان کردبو شکاتیان لای رەئیسی عەشائر کرد ، ئەویشی ناردی گاگەلو کەرگەلەکەیان هانین دوای زیانی دەغـــلو دانیان بژارد ، پاشا ئەمری کرد ئاژەڵیان بدەنەوە کەری کابرایەك گومبو بو چوە لای پاشا وتی : پاشا من پارەی خۆمم داوە نیرەکەرەشمم نادەنەوە ، پاشا وتی : بچۆ بزانە لای کێیە ؟ بۆت لیبسێنمەوە وتی من لەتۆم گەرەکە ، پاشایش وتی : من لەکوێت بۆ پـــەیدا بکەمەوە ، ئەمان لەم مشتو مرەدا بون ، هاورێکانی وتیان :نەریمان

بێ‌وەرێوە . ئەویش وتی : تیوە گشت کەری خۆتان بردۆتەوە . من ماوم پاشا ناچێتە ژێر کەرەکەم چۆن بێم وەرێوە ؟!

نەزان دووی کەلام تەفرەقەی شرم برم بێژ

مەحمود پاشای جاف جارێك ئەچێ بۆ هەوارگەی گەلگە نــاو ماڵە گەورە ئەگەنە بەر پاساماڵ ئەبینی خێلیکی ئێلی جاف لـــەو هەوارە بەرزەو لەو شوێنە هەوادارەو ئەو چەشمە ئەندازە شیرینە دابەزیون زۆری لاخۆش ئەبێ ئەڵی : بالادەین دابەزین نــەختێ بحەسێنەوە که ئەچن دائەبەزن پاشـــا زۆری پێخۆش ئـەبێ خێڵەکەش خێڵی محمود ئاغە دەبێ ، محمود خۆی هەتابڵێی نەزان دووکەلام‌تەفرەقەو شرم‌برم‌بێژئەبێ دووژنی‌ئەبێ‌یەکیکیان‌پیری‌ئەوی تریان خێتێ ، پیرێیان شارستانی ئەبێ چێشتی باش لێ‌ئەنی بـــە محمود ئەڵی : دارێر ئەبێ جارێ بازی بەسەرەوە ئەنیشی ، باس دەست‌و برد قبوڵەکەو شلەقاورمەیەك پێ‌بگەیەنم محمودیش ئـەڵی باشە ، پیرێ تاپاشا نەختێ ئەحەسێتەوە قاورمە جافی‌و قبوڵی‌و شلە قاورمە پێ‌ئەگەیەنی کەنان دائەنێن پاشاو تەمیز پاشا زۆری پی‌خۆش ئەبێ ئەفەرموی ماڵتان ئاوابی و هەواریشتان خۆش‌و نان‌و پەتیشتان بەلەزەت بو . محمود ئەڵی : پاشا خۆ نەچوەبێچێ بـــیرەناومان دەوارێکی خاسم هەس ئەت‌دەمێ ، دو دێڵە شریشم هەیە یەکیکیات ئەکەمە قەبەڵ ، پاشا قەدەرتێ پی‌ئەکەنی‌و سوار ئەبێ‌و ئەروا ، با لەو سەرەوە کەئەگەرێنەوە پاشا ئەفەرموی : بالادەینەماڵی محمود

بزانین دیله شرمان ئەکاتە قەبەڵ یان نا؟ بەخوا من ئەم ماڵەگەورەو شارستانانەم دیوە قبولی وام نەخواردوە ، ئەمە ڕێکەوت بو بزانین ئەمجارە قبولی وامان دەست ئەکەویتەوە ؟ والحاصل کەئەمجن دائەبەزن پیزە دیسان قبولی‌یان بۆلێ ئەنی بەلام خێتەی هەویێی بەدزی‌یەوە مستێ خوێ ئەکاتە چێشتەکە سویری ئەکا پیزی دێت لی‌ی ئەچێژی ئەبینی سوێرە بەخێتێ ئەڵی : نامەرد بۆچ سویرت کرد خێتیش ئەشلەزێ ئەڵی وام زانی خوێت تێ‌نەکردوە کەنان دائەنێن چێشت سوێر ئەبێ پاشا ئەفەرموی : حەیفە ئەمجارە قبولیەکەتان سوێرە . محمودیش ئەڵی : پاشا بەخوا پیزە خاسی لێ‌نابو بەلام بەسەری پاشا خێتێ گوی نی‌کرد ، ئەوە بو منوتم بادێلەشرێکیات بکەمە قەبەڵ تۆ نەت‌گەرەك بو سانەوە گۆرتبێ .

## کەڵور لای خوا نادانە قەڵەم

حەسەن بەگی قادر بەگ خوا بی‌بەخشێ حێلی کەلوری بەبەش بەر کەوتبو أدارەی بە واردات و سەرانەی ئەوان بو ، کەلوریش زۆرتریان دەرویش بون ، دەرویشی کۆسەی هەجیج ، میرزاحسێن کاتبی أوضا بەگی بارام بەگ بو ، بەلام لەخزمەت حەسەن بەگدا ئەبو ، حەسەن بەگیش لەنوێژدا موسوس بو دەنگی هەڵ ٠ ری ئ لەرکوعدا کەهەڵ ئەستایەوە بە دەنگی بەرز ئەیوت : ( ربنا لك الحمد ) پاش نوێژی خەوتنان‌کە سوجدەی ئەخویند یەکەم کلیمەی ئەمەبو (تتجافا جنوبهم عن المضاجع ) ، میرزا حسێن ڕۆژێ هەوسی

بو فیتەیەك بگێڕێ بەکویخا بەخشەی کەلوری وت : ئیوە بە دڵو بەگیانو بەسەرو بەماڵ خزمەتی حەسەن بەگ ئەکەنو ئلغاتانە ،
کەچیهەرچەند نوێژئەکا لەپێشدادەست هەڵ ئەبرێ دوعابۆ (لك) ئەکا ئەوا بڵێین خۆی جافە هەمو شەوێ کە قورئان ئەخوێنی لـــە پیشەوە لەحضور خوادا جاف بە تەتە دائەنێتەتەش بە مەعنایجوان ئەتەجانە ، یەعنی جوانەجاف ، قەد ناوی کەلور نابــاو لای خــوای نادائە قەڵەم ، کوێخا وتی : ئابرا توخوا راست بێژە ئەمە واســە ؟
مرزا حسین وتی : خۆ ئەمە کارێکی گران نیە ، ئائیســتا تیت نوێژ ئەکا ، کەلە دیوانی خوادا چەوتایەوە و سەری هەڵبری بزانە(لەك) بەڒی یانا ، شەویش دوای نوێژ کویت تیوە بێ بزانــە تەتە جــاف یەڒێ یانا ، سازۆری پێ نەچو حەسەن بــەگ هــات و نــویـژی دابەست ، کویخاش بێ خشە سەرنجی دایەو گوێی تەواو بوشل کرد لە گەڵ وتی(لك الحمد) کویخاوتی پێجکی گشت لەك وەدایك گشت کەڵور ئەگەر نەوینە خەرج بدەی بەگــزادەیەك کە دۆعــای خیر بۆ کەڵور بکات ئەمەی گوت و بۆی دەرچو هەرچەن حەسەن بەگ نوێژی بڕی و شوێنی کەوت کوێخا هەر نەگەرایەوە تا هەمو کەڵوری لەحەسەن بەگ هەڵ گیرایەوە و تەراندی ٠

## نــوێـژدان و ســەرنوێــژ

خێڵێکی ئاخەسوری مەلایان ئەبو ڕۆژی شیخێك ڕێی کەوتــە ئاوایەکەیان وتی : ئەوە بۆچ مەلایەك نایەنن ؟ئــەگــەر نوێژیش

نەگەن بەمندالّتانبخوێنێ ، مردویەکان مرد یاسین و تەلقینی داداو
رەمەزانان وەعزتان بۆ بخوێنێ ؟ بەقسەی شیخیان کرد چون
فەقێیەکیان لە پێنجوین هێنا و چاتولێکیان بۆ هەڵدا ناوی
چاتولەکەیان نابو (نویژدان) و بەمەلایان ئەگوت (سەر نویژ)
گەرماوگەرم خویان دابوە نویژو مەلایش دەنگی زور خوش بو که
ئەی لەراندەوە (بسم الله الرحمن الرحیم) رەحیمەکەی دریژ
ئەکردەوە ، کوێخاکەیان ناوی ( رحیم ) بو زۆری پێخۆش بو
کەبەدەنگ رەحیم بخوێنی ، هەرساتە نەساتێ خەڵکی کۆئەکردەوە
ئەی هێنایە سەر مەلا ، ئەیان گوت : دەی مەلا بخوێنە ، مەلایان
پێزار کرد وای لێهات ڕاکا ، کولەکەیەکی گەورەیان دابویە
ئاوی تیابخواتەوە ، رۆژێ شارە زەردەواڵەیەکی دۆزیەوە چو
کولەکەی هێناو چیلکەیەکی کرد بەکونە زەردەواڵەکەدا وروژاندی
دەمی کولەکەکەی نابەکونی شارە زەردەواڵەکەوە کولەکە پر بولە
زەردەواڵە ، تۆپەوانەی خستە دەرکیو هێنایەوە لای خۆی دایئەنا
تا کوێخاو خەڵکی ئاوایی کۆبونەوەو دیسان پێیان وت : مەلا
ئادەی بخوینە. مەلا دەستی پێکرد: اعوذ بالله من الشیطان الرجیم
مێزەرەکەی لەسەرو ملی خۆیەوە ئالاندو دەرکی کولەکەی کردەوە
بەجاری زەردەواڵە بەقینەوە هاتەدەرێ هەریەکە سێ ...ار
زەردەواڵەی تێوروژاو جزەیان لێهەڵسا ، لەتاوا بەقیژوهور هەر
یەکە بەلایەکا رایان کرد ، مەلاش کتیبو بەرمالی هەلگرتو

بۆی دەرچو •

جا ئاوایی پاش ماوەیەك هەواڵی گوم بوانیان ئەپرسی ، یەکێك بانگی کردە کابرایەك کاڵە دەست زەردەواڵـــە رزگاری بوبو ئەهاتەوە ، وتی ئەری شاکە گیان مـــیروەیسی تێمەت نەدی ؟ وتی بەری‌وەللە سێ‌چوار شەیتان رەجیمەکەی تێ‌ئاڵابو لەچەمەوە سەرەو خوار بردیان هەروا ئەویش هەڵی ئەتوڕاند جا نازانم چی لێ‌هات ناپانە گۆری باوکی کوێخا ڕەحمەوە •

## خەوەکەی لالە سەرحەدو سەرراج

لالە سەرحەد ئاشنایەکی سەرراجـی بوو زۆری خـۆش ئەویـست هەمیشە لەگفت و گۆیشدا بەربەرەکانێ‌یان‌لەگەڵ یەك ئەکرد

شەوێ میوانی لالە سەرحەد بوو ، بەیانی هێشتا لەخەوا بوو ، لالـە سەرحەد هەڵی کوتایە سەر جێگاکەی نووکە شەقێکی تێوە ژەنـد بانگی کرد : ئاکوڕە راستەوەبە گۆرانە هێزە نیوەڕۆیە • کابرا بـە دەم خەوەوە وتی : گەماڵەپیرە بەمیوانیش ئەگەڤی • لالەیش وتی ئابرا تۆ دەنگ • ئەمشەو خەوێکم دیگە کەسی وا نەوو فاڵەکەیم بۆ بکرێتەوە ، وەتۆی پەژم • سەرراجیش وتی : تۆ بێژی ئەگەر پجڕ پجریش بێ بە دەرزی‌و درەوش پێکەوە گیرەو بەند ئەکەم • ئنجا دەستی کردە خەو گێرانەوە وتی :

سەید صادق و بالاتەران گوێ‌یان‌پیوەبێ ، گـوێی دوژمـن کـەم بێ و چاوی گشت وردە شاتری و کـەلاڵی کـوێر بێ، لەخـەوما

گوێلکە مێنجکەیەکمان گووم بوو بوو ، شوێنم هەلگرتبو ، گەیمە
ئەو دەشتی نێرگسە جارە روانیم پیاگێ ریش چەرمگێ نوورانی لە
سەر بەردەکەی مەحمود گاوان لێی هەلاڕیاگە ، گالۆکێکی وە
تەنیشت خۆیا راکیشیاگە و بوزگیکی لاو خاصی لەبەر دەماویسیاگە
چست و چالاك مەگەر هەر خۆم لەتافی کوڕێنیما وا وریا بوووبم
پرسیم : ئەرێ برا تۆ کێی و ئەو پیرە کێس ؟ وتی : لالە! ئەوە
بینایی چاوانە و منیش حەمەدی رەسول‌اللام • لەدڵی خۆما وتم: پیاو
وەخوا خاس‌وو ئیستا وەکەرامەت سۆراخی گوێلکەکەم بۆ ئەکا
چوومە بەرەوە سەلامێکم کرد لەحازری هیچ نەجمیا ، بەلام‌وەلای
لووتێکەوە بۆڵەیەکی لێوە هات وەکو جوابی سلاوەکەی دابێتەوە،
تەمام بوو تووڕە بم بێژم : کاورا سلاو سلاوی خوایە تۆ بۆچ خاس
جوابم نادەیتەوە ، وەگالۆکەکەت ئەنازی ، حەمەدی رەسول‌الله
دەرکی پێ کرد هاتە بەرەوە وتی : قوربان ئەوە لالە سەرحەدە لالە
سەحەد • • • ئنجا جمیاو چوارمشقی لێی دانیشت وتی : لالە
وەخێر هاتی مەروانە قصور شەو نەخەوتبووم نیازمان بووبێ بێنە
میوانی تۆ ، جارێ ئەم دەشتەم لاخۆش بوو • وتم : قوروان وەخیر
بێی فەرو بەرەکەت هاورد • ئاوڕم دایەوە پێ کوڕەیەك لەچەمەوە
ئەهات بانگم کرد : ئا کاورابێ لاوەلا • کاورا وەهەڵەداوان‌رای
کرد هات • وتم : بتینم چۆن رادەکەی هەروماڵ تیمە بێژە وەخازە
میوانمان تێت شەکە گێژەکەسەر وڕن گۆشتی شەکی گێژو درەوی

لێژ • پیکوڕ ەرۆیی و منیش بەرو بەرپشتێنی بینایی چاوان کیسەو
سەویلم نەدی ، سەویلەکەی خۆمم دەرئاورد فرە ئازیز بوو لەلام،
لەو ساڵەوە خازمم هاوردبوو چووبوومە تانجەرۆ وسل یکەم ئەو
سەویلەم دۆزبوەوە کیسە تووتنیش هەر ئەوکیسە بوو کەوەمنداڵی
قەیتول و خوێشکەکەی چەن جار پیا میزیابوون • خازە ئەی شێت
بەڵام تووتنەکەم فرە خاس وو کوڕ گەل لەکاروانی بەغدایان دابوو
هەندێ تووتنیان بۆ هاوردبوم سەویلی خاسم تێ کرد دامە دەست
حەمەدی رسول الله بۆم بگرێ تا ئاگری بۆ دەکەمەوە هەسی و
بەردەکەم دەرئاوردو گازێ پووشووی ناودارم داگیرساند سەویلم
لەدەست وەرگرتەوەو پووشووم خستە سەر قوومێکم لێ داتاداگیرسیا
دامە دەم بینایی چاوان مژێکی لێدا فەرمووی ! لالە ئەم تووتنەتە
لە کوێ بوو ، فرە خۆشە بێژە جاخێکم بۆ دابگرن لەتەك خۆما
ئەیوەم • وتم : بەچاوان •

لەو سەردەمەدا ئاوڕمان دایەوە سوورکەوە سوارێ تۆز ئەکا،
هات بەلام چ هاتنێك بای غەزەو تۆزی پێی ناشکێنێ • تومەزئەمە
قەیتولی منە کاورای پێکوڕە خەبەری بردبووە ماڵ ، ئەویش وە
بەیجوری میوانەوە هاتبوو • بینایی چاوان پرسی : لالەسەرحەد ئەو
سوارە کێس ؟ عەرزم کرد قوروان قەیتولی خولامتە • فەرمووی:
ماشاالله • ئابێژە چکی تۆما سوورکەوە بتاخێوێ • منیش وتم: قیتە
تا بتوینم خۆم ئاسایی وەجاخی باوکت روون کەرەوە • قەیتولی

ئلونەنگی یا هـاورد خێروبێروێ نۆما هـات وە خۆیـا ، ســەری
سواریّ بوو ، کلکی سواریّ بوو ، قەیتولیش لە ناوەراستاسواریّ
وەك حەمەدی رەسول‌اللە سواری بوراق بووبێ • لەو ســەردەمەدا
من سەیری قەیتوڵم ئەکرد حەمەدی رەسول‌اللە سەری نابوەبناگوێی
بنایی چاوان تێگەیشتم بەبنایی چاوان بەژێ داوای نۆماکەی لــە
قەیتول بۆ بکا • کاکە قسەی خۆت مەدۆرێنە • قەیتولی نەگرسە
میوان نەبێ خوایش‌بی نایدا • بنایی چاوان فەرمووی :محمد لەم
نۆمایە هەر بۆ قەیتول خاسە من یەژم وەرەئیسی عەنەزە چارەویەکی
عەرەوی بۆتۆ بنێری • سا ئێمە لەم حەدیسەو بەیسەدا بووین تێ
فکرین وەك قەتارەی قولنگ سەریەك نیشتێ هەر یێ‌کورەیــــەك
لاسەلەیەك ودسەر سەرەوە نان‌هات بەلام چ‌نانێك ، دەوریە پـلاو
گشت وەك مەلای سەرچەمنگ تەشیەك ترشی‌حەسەن بەگی‌لە تەکا
( وەدەمیم ) نان دانریا خولەی ئەلی کەوکوژ وەخۆی‌و زورنایــەوە
بەیدابوو بێ‌ئەوەی کەس یێ‌ی بێژێ یکی زورنـای لێ‌خۆش کرد
فیقاندی وەزورنادا ،ئەوانەی نانیان هاوردبوو کەوتە زەندن کاورای
دەهۆل زەنی قلیاسانی وەفرکانی دەهۆلی گەیاند لـەتەقەی دەهۆل‌و
زورنا لە گشت لایەکەوە کەنیشك‌و شۆڕەژنی جاف گلیرەوە بوون
بووە رەش‌بەڵەکێك بۆ محمد پاشایش ئەو زەماوەندە نەکریاوو جـا
براکە چەند خۆش بوو وەدەنگی دەهۆل‌و زورناوە ئەو نانە نۆشـی
گیان کریا • محمد رەسول اللە فەرمووی : شنبنە ، نـسەمزانی چی

یەڕێ ، دوایی تێیان گەیاندم دۆی گەرەکە ، مەشـــکە دۆ هات
کاسەیان بۆپر کرد کەوچکی نەگەرەك بو کاسەی ناوسەرەوەتۆخەیچی
کرد ، منیش وتم تۆشی گیات وێ ، هەروا لەدەنگی دەهۆڵ گلیرەوە
بوون میکایلی و شاتری و سەداتی ، بینایی چاوان پرسی ئەمانە کێن ؟
عەرزم کرد قوروان : مکایەلین لەتەك تیمەدا ناکۆکن • فەرمووی:
رایان کێشنە ئەو جەهەننەم • لەژیرەی ئەوان خەبەرم بووەوە •

کاتێ لالەسەرحەد ئەم خەوەی گێرایەوە سەرراج وتی : لالە
تۆیەژی ئەم گشت طەعامەیان هاورد خۆمن هیمان لەماڵی تۆچەشەی
برنجم نەکردگە ، خازە هەر یەژێ برنج نەکوتیاگە چۆن بەو دەمو
دەستە کوتریاو لێنریا • منیش ئەمشەو خواوەخێری بنووســـی
خەونێکم دیگە • لالەسەرحەد وتی : ئابرا بێژە تۆچیت دیگە ؟ •

## خەوەکەی ســـەرراج

سەرراج وتی لەخەوما من زینێکم بۆ چارەوی فلقنەکەی تۆدروو بو
پارەت نەدابوومی ، هاتم بەگژتا تۆیش دەستت لێدابوومە شـــیرو
صوباشی ، حەمە صالح بەگی قائمقامی هەڵـــەبجە گرتینی و بردینیە
دیوان پرسی : ئەرێ گەماڵە پیرەی بێ کەڵبە گەفیکە ئەم پیاوە زینی
بۆ ددروی پارەت بۆچ نەداوەتی • تۆ وتت میرم هالە ماڵما بەخێوی
ئەکەم پارەی چی بدەمێ ؟ ئـــەمری کرد هەردوکمانیان راکێشـــا
منیان خستە چاڵی پیسایی بەوە ، تۆیان هاویشتە چاڵی هەنگوینـــەوە
گشت لەبشمان تێوەچوو • لالەسەحەد هەڵیدایە وتی دەبخۆ ئـــەوە

گۆرت ویّ خاسی تیا گەوزابوی • سەرراج وتی ئەریّوەڵلا تیا قوربن بوو بووم ـ لاله بەکەیفی بوو کەوتە تیّ تاڵ ـ وتی خۆزایی نی‌یە دەعووەتم بۆ بینایی چاوان کردگە • سەرراج وتی ئەوسا تۆ پێکەنیت میرزقی هەڵما ئەمری کرد ( مەوا شیو بدە لیّیان پێ‌زوە ئەشنیّ یەکتر بلێنێنەوە ) من دەستم کرد بەڵێنانەوەی تۆ ، تۆقێزت هاتەوە • لالەسەرحەد دەستی کرد بەجنێودان وتی دەویت بساوك ئەوە خەوە ؟ سەرراج وتی ئەبی خەوەکەی تۆ خەوە ، قلیانت لە تووتنی میزاوی تیّ کردووە بۆ چارەوی‌یەك کەبە دزی‌یەتی چنگتان کەوتووە قسەی خوا دڵی پێغەمبەرت شکاندوە •

---

وێنەی بەرگ بەرهەمی ماموستای هونەرمەند ئەنوەر تۆفیق‌یە

چاپخانەی کامەرانی ۳۱ ـ ۲۰۰۰ ـ ۲۲/۱۱/۹۷۰